# حوکمی هێنانەوەی مەنی بەدەست

# الإستمناء


نوسینی

أحمد صالح ڕەشید

ئیمامی مزگەوتی نەزمی

مامۆستا لە قوتابخانەی ئەبوبکری صدیق

پێداچوونەوەی

مامۆستا عبدالله محمود

ئیمامی مزگەتی ئەبوبەکری صدیق

مامۆستا دابان مەلا صالح بامۆکی



چاپی دووەم

منتدى اقرأ الثقافي

١٤٢٥کۆچی



إن الحمد لله نحمده ، ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادى له ، وأشهد أن لا إله الا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمد عبده ورسوله .

﴿ ياأيها الذين امنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون ﴾

﴿يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام ان الله كان عليكم رقيبا ﴾

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وكفى والسلام على عبادة الذين اصطفى ، وبعد

خوێنـەرانی بـەڕێز سلاوی خوای گـەورەتـان لیٚ بێت ئـەم نوسراوەی بـەر دەسـتان مەبەستمان پێـی ئەوەیـە خـەڵکی کـورد زمـان ئاشـنا بکـەین بـەحوکمی شـەرعی ( ئیستمناء ) لەبەر ئەوەی خەڵکی زۆر ئە پرسن دەربارەی ئەم مەسەلەیە ، ئێمە بـە دەمی وەڵامی زۆرێك لەو خۆشەویسـتانەمان داوەتـەوە ئیسـتاش ئـەم نوسینەی کـە لەبەر دەستدایە داواکارین لە خوای گەورە جێگەی ڕەزامەندی بێت و ئەو کەسانەش ڕزگـار بکـات لەنەفسی بـەدخویان کـە چۆکـی پێدا داون لـە زنگـاوی ئـەم کـارە نا پەسندە دا چەقاندونی چاوەڕوانی سەرنج و پێشنیاری دڵسۆزی ئێوەی خوێنەرانی بەڕێزیشین و ئەزانین تەنیا خوای گەورە و شەرعی ( حەنیفی ) ی ئەو بیٚ لەکەیە .

احمد صالح ڕەشید
ئیمام مزگەوتی ئەزمەڕو مامۆستای قوتابخانەی
ابو بکر صدیق
٧ی شوال ١٤٢١ ی کۆچی
٢٠٠١/١/١ زایینی

# پێشکەش کردن

### ئەم نوسینەم پێشکەش بە :

- باوکی خۆشەویست و پەروەردەکەرم.
- بە ئەو کەسانەی کە زۆر دەمێکە خولیای ئـەم باسـەن و بـە تاسـەوە بـەدوایدا دەگەڕێن.
- بەو کەسانەی کەلەبەر خاتری خوا خۆشم دەوێن و بەس.
- بەو کەسانەی دەیانەوێت راستە شەقامی دروستی شەرعی بگرنە بەر.
- بەو کەسانەی کە شەرع و بەرنامەی خوا وەکو خۆی دەگەیەنن و، وەری دەگرن.
- بەوانـەی کـە تەنـها تـێرکردنی غـەریزەی توخـم(جنـس)ی ناکەنـە ئامـانج و مەبەست.
- وە بە تایبەتی بەو کەسانەی: کەئەم ڕاستیانەی زانی دەست بـەجێ بـە خۆیـدا نەچێتەوەو پاشان بڕیاری کۆتایش نەدات.

﴿والذين هم لفروجهم حافظون، إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين، فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون﴾

المؤمنون/٥-٧..

واتە: ئەوانەی کە داوێن پاکن، وە ئاگاداری داوێنی خۆیان دەکەن، واتـە: (زەکـەر) یـان لەشتی حەرام دەپارێزن(٥) مەگەر تەنها لەگەڵ هاوسەری شەرعی خۆیـان نـەبێ، یـان لەگـەڵ کەنیزەکێک (جاریـە)یـەک کـەبووبن بـەخاوەنیان بێگومـان ئەوانـە سەرزەنشـت کراونـین (٦) ئینجا هەر کەسێک بەدوای شتی تردا بگەڕێ، واتە داوێن پیسی بکات، یان ژنێک مارە بکات بۆ ماوەیەک کەپێی دەڵێن (مرتعة)، یان لەگەڵ خێزانی خۆی لە ڕێگـەی ناشـەرعییەوە دروست بێ، یان لەگەڵ نێرینەدا یان لەگەڵ گیاندار دروست بێ، وەیـان بـە ئـەندامێکی لەشـی خـۆی ئاوی خۆی بهێنێتەوە، ئەوانە ئەو کەسانەن کەلـەڕێی ڕاسـت لایـان داوە و سـنووری شـەرعی خوای پەروەدگاریان شکاندوە (٧).





# دەروازەیەك

**الحمدلله رب العالمين.. الحمدلله الذي نزل أهل الحديث أعلى منازل الشريف.. والصلاة والسلام على خير خلقه سيدنا محمد النبي العفيف.. وآله وصحبه و أتباعه الى يوم الدين.**

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەدگار.. سەلام و بەزەیی خوا لەگەڵ ڕێزدا بۆ سەرگیانی ڕابەرو پێشەوای مرۆڤایەتی محمد (ﷺ)، وەداوا کردنی لێبووردن و بەزەیی خوا بۆ سەر ماڵ و یاران وشوێنکەوتوانی بەگشتی..

*<u>برایانی خۆشەویست وهاوبیروبڕوام:</u>*

سوپاس بۆ پەروەدگاری جیهانیان وابۆ ئەم جارەش لە (بەشی حەوتەمی) (پەروەدەو پێگەیاندن لە قورئاندا) بەیەك دەگەینەوە، هیوادارم ببێتە مایەی خوا لە خۆڕازی کردن و سوودگەیاندن بە هەموو ئەوکەسانەی کەلەبارەی ئەم بابەتەوە ئەپرسن، وەداواکاریشین لەبەدیهێنەری بونەوەر کەئەم هەوڵ وکۆششەمان تەنها لەپێناوی ڕەزامەندی وخۆشەویستی ئەودا بێت وبەس. إن شاء الله.

ئەم بەشەمان بەپشتیوانی خودا دەبێتە وەلامگۆی هەموو ئەوکەسانەی زۆر لەبارەی (ئیستمناء) واتە هێنانەوەی (مەنی) مرۆڤ بەدەستی خۆی، کەپێویستە هەموو گەنجێکی تازە پێگەیشتوی ئەم ئیسلامە حوکمی کردن و زیانی ئەم کردارە ناوازە وناسروشتی‌یە (غیر طبيعي) یە بزانن و هەتا لەکاتی زۆر زۆر ناچاری و (ضروري) دا نەبێت پەنای نەباتە بەر وکەنارگیری و دوورەپەرێزیی تەواوی لێ بگرێت، هەتاوەکو دڵەکانیان و داوێنەکانیان هەر بەپاك وخاوێنی بمێنێتەوە، چونکە بەڕاستی پاراستنی داوێن و دور خستنەوەی لەشتی خراپ وبەدڕەوشتی هەروا شتێکی سادە و ئاسان نی‌یە، وەلە هەمان کاتیشدا پاداشت یشی هەروا کەم و ساکار نیە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەو گرنتی و کەفیلی بەهەشتی بەو کەسانەداوە کە ئەگەر بێت و داوێن وزمانیان بپارێزن لەشتی خراپ وناڕەوا وە گرینتی وکەفیلی زمان و داوێنیان بن ئەوا پێغەمبەری خواش زەمانەت و کەفیلی بەهەشتیان بۆ ئەکات وەکو ئەفەرموێت:



(من يضمن لي ما بين لحييه وما بين رجليه أضمن له الجنة) (متفق عليه) .. واتە: هەرکەسێک ئەوەی لەنێوانی لێوەکانیدا کە (زمانیەتی) و ئەوەی لەنێوان قاچەکانیدایە کە (داوێن و عەورەتیەتی) بپارێزێت ئەوا منیش بەهەشتی بۆ دابین دەکەم، دیارە دەبێ ئەوەبزانین کە دەست خستنی بەهەشت هەروا شتێکی کەم وسادە نیەو لەکەم هەڵوێستی وادا بوە کەپێغەمبەر(ﷺ) ناوی بەهەستی تێدا هێنابێت، لەڕاستیشدا ئەوشتانەی کە مرۆڤی تێدا سەرگەردان ومالّ وێران ئەبێت و بەناخی گوناه وتاوانبارێدا دەیباتە خوارەوە زیاتر لەڕێگای ئەو دووشتە سەرەکی‌یەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دیاری کردووە، کەئەویش لەڕێگەی داوێن و زمانیەوەیەتی.وەزیاتر ئەم دووشتە مرۆڤ توشی گێژاو و گەردەلولی ماڵ کاولی ئەکەن، بۆیە هەر کەسێک توانی پارێزگاری لەم دووشتە بکات بەچاکی، جێگای خۆیەتی کەپێغەمبەری‌خوا (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێ بدات[1].

ئاشکراشە سروشتی پرۆگرام و بەرنامەی ئیسلامیش وەهایە کەهەر لە سەرەتاوە شتە گرنگەکان وبنچینە سەرکی‌یەکان بەتوندی ئەگرێت و یاساو دەستور وسنووری تایبەتی خۆی بۆ دا ئەنێت، هەتا پێش ئەوەی کە بکەوێتە ناو (ڕوداوە)کەوە، وتەیەکی عەرەبیش هەیەو دەڵێ (الوقاية خير من العلاج) واتە: خۆ پارستن چاکترە لە چارەسەرکردن. وەئاینی پیرۆزی ئیسلامیش ئادەمیزاد دەپارێزێت پێش ئەوەی هانی بدات بۆ بەکارهێنانی چارەسەر چ جای ئەوەی قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزادەکە هەموو کەسێکی پێدا تێپەڕ دەبێت، وەهەموشی وەکو یەک حەزو ئارەزووی بەتین و بەکوڵیان هەیە لەبیرکردنەوەو ڕۆچوون بەناو هیواو ئاواتەکانی و حەزوئارەزوەکانیدا، خۆ ئەگەر بێت و سنوور و یاسایەک دانەنرێت بۆ ئەم حەز و ئارەزووانە ئیتر لەزۆر شتدا مرۆڤ وگیانلەبەر تێکەڵاو دەبێت و لەیەکتری جودا ناکرێنەوە تەنهابەوە نەبێت کەئەم گیان لەبەرێکی قسەکەرەو ژیرە ئەوگیان لەبەرێکی بێ زمان و بێ گفتوگۆیە. دیارە ئەمەش لەبەر نامەی ئیسلامدا هەرگیز بەم شێوە بەر بەرەڵایی‌یە پشتگوێ نەخراوە بەڵکو بەرنامەو یاسای تایبەتی خۆی بۆ دانراوە، بەتایبەتیش قۆناغی گەنجێتی‌و تەمەنی لاوی، کەتەمەنێکی زۆر ناسک وهەستیارە (حساس)ە، کەتەمەنێکە

---

(١) زیاتر ئەم باسەمان لە بەشی(سێیەم و چوارەم)ی ئەم بەرگەدا لە ژێر ناونیشانی(جیهادی نەفس و پاککردنەوەی دەروون) دا زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

دەتوانرێت هەموو شتێکی تێدا بە ئەنجام بگەیەنرێت، وەهەموو ئیشێکی تێدا تۆمار بکرێ چ لەبواری چاکە کردنەوە، وەچ لەبواری خراپەکاری و وێرانکاریەوە، وە دەتوانرێت لەوتەمەنەدا بەهەشت بکڕدرێت، وە وە دەشتوانێت خوانە خواستە خۆی بەرەو چاڵی ئاگرینی دۆزەخ بەرێت (خوا بەدورمان بکات). بەڵێ هەر لەوتەمەنی لاوێتیەدا کەچەندەها داستانیپاڵەوانێتی تێدا تۆمار ئەکرێت، وە چەندەها کۆشک و تەلارو قەڵای زۆر دارانی پێ دەڕوخێنرێت، جا ئەگەر بێت و ئەم ئەونەمامانە لە پێناوی چاکەو خێراخوازیدا بەکار بهێنرێن، ئەوا دادو یەکسانی باڵ بەسەر جیهاندا ئەکێشێ، خۆ ئەگەر بێت ولەسەر خراپەو خراپەکاریدا پەروەدە بکرێت ئەوا جیهان وێرانی و شەڕ و شۆڕی بەردەوامی بەدواوەیە، لەبەر ئەوە قۆناغی گەنجێتی ئەو قۆناغە گرنگ و شکۆدارەیە کە بەرنامەی خوا لێی بێئاگا نیە و دەستوور و یاسای بۆ داناوە، چونکە بە زۆری ئەوانەی کەمەشخەڵی ئازادی و سەربەستی و سەرفرازیان هەڵگرتووە هەر گەنج و لاو بوون، وەئەوانەی کەلەدەوری پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوو بوونەوە و ئاڵای پیرۆزی ئیسلامیان هەڵگرتبوو بەزۆری گەنج و لاو بوون، بۆیە زۆر پێویستە ئەو گەنج و لاوانە واپەروەردە بکرێن کە کوفر نەتوانێت لەپێناو ئامانج و نیازی گڵاوو چەپەڵی خۆیدا بەکاریان بهێنێ و بەناو زۆنگاوی تاوانباری و شەرمەزاریدا نەیان باتە خوارەوە. بەڵکو پێویستە ئەو خونچە تازە پێگەیشتووانە وا پەروەردەو ووریا بکرێنەوە کەبزانن کام بەرنامەیە دڵسۆزو لە سوودو بەرژەوەندی ئەودایە و کام بەرنامە دەستکردەشە کە لە زەرەرو زیان و تیا چوونی ئەودایە، بەڵکو بگرە لەدابەزاندن و شکاندنی ڕێزو نرخیدایە.

بەڵێ پێویستە گەنج و لاو لەسەر بەرنامەی ئیسلام پەروەردە بکرێن بۆ ئەوەی ببنە خێرخوازو چاکە کار و پیاوی مەردو لێهاتووی دوارۆژی ئەم ئیسلامە، بەدووریان بخەینەوە لەو دەستە چەپەڵەی دوژمنانی ئادەمیزاد کەهەموو جیهانی ئیسلامی داگرتووە، دیارە ئەو بەرنامە ناشەرعی و ناشایستەیەی کە بێباوەڕی جیهانی بەدیاری بۆ گەنج و لاوانی ئێمەیان هێناوە لەسەر ئەو بنچینە و بناغەیە لەخشتەیان دەبەن و بەرنامەی ژیانی ئاژەڵی و بەرەبەرەڵایی و بەبێ سنوور هەڵگرتنی حەیاو دڕاندنی پەردەی شەرم و شکۆمەندی چاندنی تۆوی بێ باوەڕی لەناویاندا، باوەڕنەبوون بەخوا، باوەڕ نەبوون بەڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە، دونیا کردنە هۆ یەک بۆ تێر کردنی ئارەزوو بە شێوەی ناشەرعی و ناسروشتی..

بەڵێ بڵاو کردنەوەی ئامێری فەسادو بەرەڵایی و بەدڕەوشتی لەڕێگەی گۆڤار و ڕۆژنامەو تەلەفیزیۆن و سەتەلایت و سینەماکانیانەوە لەناوجەرگەی وڵاتانی ئیسلامیدا گەورەترین هۆیە بۆڕاکێشان و کەمەند کێش کردنی گەنجان بەلای خۆیاندا ئەویش تەنها لەڕێگەی ئافرەتە دۆڕاوو نەفس نزمەکانی لای خۆیانەوە کە بەبێ شەرمانە بەڕوت و قوتی پیشانی ڕۆڵە تازە پێ گەیشتووەکانی ئێمەی دەدەن، بۆ ئەوەی لەڕێگەی جینسەوە بتوانن زاڵ ببن بەسەریاندا و لە لیتاوی دەریای جینسی‌دا نوقمیان بکەن و هەتا بیر لەئازادی و سەر فرازی گەلەکەیان نەکەنەوە، هەست بەفرۆفێڵ و تەڵەکەبازی ئەوان نەکەن، ناوەڕۆکی گڵاوی بەرنامەی شوومیان ئاشکرا نەبێت، هەتا ئەمانیش وەکو خۆیان خاوەنی حەیاو شەرەف و ڕەوشت نەبن وخاوەنی مەردایەتی و هۆشیاری و لیهاتووی نەبن، خاوەنی ئەمانەو چەندەها شتی‌تر لەمانە گرنگ‌تر نەبن... بەڵێ فێڵ و تەڵەکەبازی بێباوەڕی جیهانی زۆر زۆر لەوە فراوانتروو گرنگترە کەئێمە لێرەدا لەپێشەکی‌یەکی کەمدا بتوانین پەردەیان لەڕووهەڵماڵین، نەخێر بەڵکو ئەوەباسی تێر و تەسەلی و فراوانی خۆی دەوێ... بەهەر حاڵ ئێمە دەبێ لەهەوڵ و کۆششێکی بێووچانی شەووڕۆژیدا بین بۆ ووریا کردنەوەی گەنجەکانمان هەتا بێباوەڕی بەنرخێکی کەم نەیان کڕێت بۆ خۆیان و لەپێناو ئامانجە نارەواکانی خۆیدا بەکاریان نەهێنێ...

وە بەبێ هودەش خوای گەورە لەفەرمایشتی قودسی‌دا نەیفەرمووە: (یا من تارك الشهوات لأجلي، أنت عندي كَبَعْضِ مَلائِكَتِي) [٢]. واتە: (ئەی ئەوکەسەی کەلەبەرخاتری من وازت لەحەزو ئارەزوە ناشەرعی‌یەکان هێناوە، پلەو پایەی تۆ لەلای من وەکو هەندێ لە فریشتەکانم وایە، هەروەها یەکێك لەو حەوت کەسانەی کە بەر سێبەری عەرشی خوا ئەکەون لەڕۆژی دوایدا لاوە، لاوێکی تازە پێ گەیشتووی پەروەردە کراوی‌ئەم ئیسلامەیە، وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویت: (شابٌ نشأ في عبادة الله) [٣]. واتە: گەنجێك کەنەش و نمای کردبێت لەعیبادەت و پەرستشی خوای گەورەدا، هەموو تەمەنی لەپێناوی خوای گەورەدا بەخت کردبێت، ژیانی ئەڵقەیەکی داخراوی خزمەتی ئەم بەرنامە پیرۆزە بێت، وەیەکێکی تر لەوحەوت کەسانە ئەو پیاوەیە: کەبەسەر ئارەزواتی جینسی‌دا زاڵ ئەبێت و ناچێت بەدەنگی ئافرەتێکی داوێن پیسەوە، وەکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرمویت: (ورجلٌ دَعَتْه إمرأة ذاتَ منصبٍ وجمال فقالَ إني أخافُ الله) [٤].

---

(٢) البخاري ومسلم/ الأحاديث القدسية - الاتحافات السنية في الأحاديث القدسية.

(٣،٤) الجامع الصغير/ المجلد ٢ ص ٤٣ - رقم الحديث (٤٦٤٥) حديث صحيح.

واتە: ( پیاوێک ئافرەتێکی جوان وخاوەنی پلەو پایە بانگی ئەکات بۆ ئـەوەی لەگەڵیدا داوێن پیسی بکات، بەڵام ئەو شێرانە خۆی نادات بەدەستەوە و بەقەڵغانی خوا پەرستی خۆی ئەپارێزێت و لەوەڵامیدا پێی دەڵێ: من لەخوا ئەترسم و هەرگیز بەدەم ئـەم کارەوە نایـەم، لەبەر ئـەوەی ئیمـان و داویـن پیسـی بـە یەکـەوە کۆنابنـەوە، چونکـە بـاوەڕ و بەدڕەوشـتیش دووشتی زۆر لەیەکتر جوودان، بەڵێ پێویسـتە گـەنجی موسـڵمان ئابـەو ڕەوشـت و بـاوەڕەوە ڕووبەڕووی داوێن پیسی و بەدڕەوشـتی بوەسـتێ، هـەتا خـوای گـەورەش شـایانی بەهەشـتی فراوان و بەرینی خۆی بکات، دەبێت وەکو حەزرەتی (یوسف) (علیه السلام) خۆ ڕاگـر بێـت و زیندان هەڵبژێرێ بەسەر ڕابواردنی جینسیدا: **﴿ قال رب السجن أحب إلى مما يدعونني إليـه ﴾** یوسف/٣٣.

فەرمووی خوایە من زیندانم پێخۆشترە لەو کارەی کە بانگم دەکـەن بـۆ کردنـی، بـەڵکو فەرمووی **﴿السجن أحـب ﴾**، واتـە: زیندانیـم زۆر زۆر پێخۆشـترە وەک لـەوەی بـێ فەرمانیـەکی خوای پەروەردگارم بکەم، کام کەڵەپیاوەی (ماددی) یەت و مادە پەرستەکان هەیە لەئاسـتی هەڵوێستی ئـاوا ناسـکدا زینـدان هـەڵ بژێرێـت بەسـەر ڕابواردنـی جینسـیدا؟ ڕابواردنێـک کـە ناوازەترین ئافرەتی ئەوشارە بانگی بکات؟ کێیان هەیە لەو پەروەردەو گۆشـکراوانەی ئـەوان بتوانن دوورە پەرێز بن لەئاست تاوانی و خیانـەتی ئـاوا گـەورەدا؟ بـەڵکو زۆر بەپێچەوانـەوە بێبـاوەڕان دەڵێـن ئەگـەر زیندانیـش بکرێـین ئـەوکارە ناڕەوایـە هـەر دەکـەین، بـەڵێ پەروەردەی ئیسلامی پیاوانی وا فەراهـەم ئـەهێنێ کەبەنهێنی و بەئاشکرا خۆیـان لـەتاوان و بەد ڕەوشتی ئەپارێزن، ئەمەیە هەڵوێستی مەردانەی چاکە خوازی شوێن کـەوتوانی بەرنامـەی خواژنی پاشـای وڵات بـانگی یوسف دەکـات(سـەلامی خـوای لێبێـت) بـۆ داویـن پیسـی و زیناکردن بەووشەی **﴿ و راودته ﴾** [٥] واتە نەجارێک و نەدوان و نەسیان بەڵکو چـەندەها جـار، هەوڵی لەگەڵ داوە و دووبارەی کردۆتەوە و بەرۆکی پێ گرتووە هەتا(یوسف)ی بێ تاقـەت کردووە، بـەڵام یوسف پێغەمبـەر پـەروەردەکراوی بەرنامـەی خوایـە، چـۆن خـۆی ئـەدات بەدەستەوە؟ چۆن بەدەم ئارەزواتی نەفسی و جینسی یەوە ئەچێت!.

---

(٥) بڕوانە /النبوة والانبياء/ دانراوی محمد علی الصابونی/ لەباسی(یوسف)دا.

بەڵێ خۆشەویستان بۆیە خوای گەورە باسی نموونەی یوسف پێغەمبەری (سەلامی خوای لێ بێت)کردووە هەتا بۆ ئێمەی گەنجان ببێتە سەرمەشق و مامۆستا، ببێتە وانە و پەندی لێ وەربگرین، هەتانەکە بەئارەزووی خۆمان بچین زینا و ڕابواردن و بەدڕەوشتی ناشەرعی بکەین، بەڵکو ئەگەر زیندانیش کراین لەسەر نەکردنی بێ ڕەوشتی مل کەچ ناکەین و فەرمانی خوا ناشکێنین.

کەواتە ئەی گەنجی موسڵمانی بەشەرەف دەتوانیت بە تەمەنی لاوی پڕ بەرەکەتەت بەهەشتی خوا بکڕیت و ڕەزامەندی خوای پێ بەدەست بهێنی، وەدەتوانی پێی بچیتە ڕیزی فریشتەکانی خوای پەروەردگارەوە، وەدەتوانیت بیکەیت بەقەڵغانێک و (بەرگری) هەموو خراپەو بەدڕەوشتیەک بکەیت، دیارە ئەم شتانەشت تەنها بە ئیمانەوە پێ دەکرێت، ئەگینا ئەگەر نا هەر تەمەنیگەنجێتی‌یە کابرای بەدبەخت و بێ دەرەتان لەڕێگەی بەربەست کردنی دینی خوا بەکاری دەهێنێت و زۆر بەئاسانی ئاگری دۆزەخی پێ دەکڕێت و خۆی شایستەی ئەوجێگایە دەکات.

کەواتە، بابەهەمووومان هەوڵ بدەین کۆمەڵە گەنجێکی داوێن پاک و چاکە خواز پەروەردە بکەین، هەتا ببنە نموونەی ڕەوشت بەرزی و خێر خوازی لەناوکۆمەڵگاکەماندا، ببنە نموونە و سەرچاوەی چاکە بن لە خۆیانەوە بۆ ناودەوروبەرەکەیاندا.

پاشان تۆ دەبێت بزانیت کە ئەرکی سەرشانی تۆ زۆر لەوەگرنگترو بەرزترە کەخۆت بەئارەزواتی جینسی بێ هودەوە خەریک بکەیت، چونکە تۆ لەڕۆژی دواییدا بەرپرسیاری لەوتەمەنەی کەبەسەرت بردوە و لەچیدا بەختت کردوە، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: (لا تزولا قدما عبدٍ حتى يسأل عَنْ عُمره فيما أفناه) رواه الترمذي، وقال حديث حسن صحيح....هیچ بەندەیەک قاچی ناجوڵێنێ لەڕۆژی دواییدا هەتا پرسیاری لێ نەکرێت: لەوتەمەنەی کەچۆنی بەسەر برد؟

وەیان پێغەمبەر(ﷺ) لەشوێنێکی تردا ئەفەرموێت: (اِغْتَنِمْ خمساً قَبْلَ خمسٍ... وشَبابكَ قَبْلَ هَرمِكْ....) أخرجه ابن أبي الدنيا فيه بأسناد حسن و رواه ابن مبارك في الزهد من رواية عمر بن ميمون مرسلاً للإمام العراقي.. واتە پێنج شت بەهەل بزانە پێش ئەوەی پێنج شتی ترت بەسەردا بێت، یەکێکیان

ئەوەیە کە گەنجێتیت بەهەل بزانە پێش ئەوەی پیری یەخەت پێ بگرێت و لەجوڵە و ووزەت بخات..

ئەمە کورتەیەک بوو لەبارەی ڕێزی گەنج و لاو لە ئیسلامدا دەبێت ببورن کە ئەم باسەمان بۆ ئەمە تەرخان نەکردوە هەتا بەدرێژی باسی بکەین، بەلام بۆیە ئەم نموونانەمان هێناوە هەتا گەنجی موسلمان ووریا ببێتەوە و ئاگادار بێت لە بەرامبەری ئەو کارەدا خۆگرو بەئارام بێت بەرامبەر بەئەنجام نەگەیاندنی داوێن پیسی و بەدرەوشتی، لەهەمان کاتیشدا پاداشت و بەخششێکی گەورەی بۆ دانراوە ئەگەر توانی بەسەر ئەم کۆسپە سەختەدا زاڵ بێت و خۆی نەدات بەدەستەوە.

وەکو لەسەرەتادا باسمان کرد کەبڕیار وابوو ئەم بەشەمان بریتی بێ لە روون کردنەوەی (ئیستیمناء) لەروانگەی ئیسلامەوە، هەتا گەنجی موسلمانی پێ ئاشنا بێت و هەر بەشاراوەیی نەمێنێتەوە و نەبێتە گرێ کوێرەیەک لەدڵیداو لێرەو لەوێ هیچ وەلامێکی دەستگیر نەبێت.

بەڵێ گەڕان بە دوای ڕونکردنەوەی ئەم باسە لەدڵی زۆر بەی تازەپێ گەیشتوەکانماندایە، دیارە هەوڵدانیش بۆ تێگەیشتن لەم باسە لەسەر ئەنجامی ئیمانەکەیانەوە هەڵ قوڵاوەو بەناخیاندا چۆتە خوارەوە، دەیانەوێت لەناوەڕۆکی ئاینە پیرۆزەکەیان تێ بگەن و لەدەستورو یاسا ڕەنگینەکەی شارەزابن، دەیانەوێت سەرفرازی هەردوو دونیا بە دەست بهێنن، هەتا لەپاشەرۆژدا پەنجەی پەشیمانی نەگەزن.

بەڵێ ئارەزومەندی ئەوەن کەبزانن ئەو شتانەی کەئاینە پیرۆزەکەیان یاساغ و قەدەغەی کردوە لێی دور بکەونەوە و خۆیانی لێ بپارێزن، جا تاوانەکە گەورە بێت یان بچوک، بەلای موسلمانی ڕاستەقینەوە وایە کەلەتاوانی گەورەو بچوک خۆیان بپارێزرێت، چونکە موسلمان ئەمین و دڵنیانی‌یە لەمەکرو سزای خوای گەورە، کێ ئەڵێ، لەوانەیە لەسەر تاوانێکی گەورە وازی لێ بێنێ و لەسەر گوناهێکی بچوک موحاسەبەی بکات، وەکو (شیخ سفیان ثوری) دەفەرموێت: (یا أخي لا تَتَهاون بالذَّنبِ الصغیر وأنظر من عصیته؟ عصیتَ ربّاً عظیماً یعاقب علی الصغیر و یتجاوزُ عَن الکبیر) واتە: ئەی برای خۆم وەسیەت بێت هەرگیز گوناهی بچوک بەکەم مەگرە و گاڵتەی پێ مەکە، تۆبزانە لەکێ یاخی ئەبیت؟ بێ فەرمانی خوایەکی زۆر بەتواناو



بەدەستەڵاتت کردوە، لەوانەیە لەسەر گوناهی بچوک سزاو ئەشکەنجەت بدات، وەلەوانەیە لەسەر گوناهی گەورەش لێت خۆش بێت، کەوا تە تۆ ناتوانیت دڵنیا بیت لەمەکر و* سزای خوای پەروەردگار، چونکە کەدەفەرموێت: ﴿ إن الله غفور رحيم ﴾ لەهەمان کاتیشدا دەفەرموێت: ﴿إن الله شديد العقاب ﴾ ، کاتێ کەخاوەنی بەخشش و لێخۆشبوونە، لەهەمان کاتیشدا خاوەنی تۆڵە سەندنە وەیەکی بەزەبرو زەنگە.

دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کەلەبەرامبەری هەموو تاوان و گوناهێکدا بەردەوام دەرگای گەڕانەوە (تەوبە) و لێخۆشبوون کراوەیە، وە تەوبەی راستەقینە دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەموو تاوانەکان کە بەوپەری (عزم) و (جزم)ەوە بیکەیت ئەوا هەروەک پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: ( التائب من الذنب كمن لاذنب له) [6] واتە: ئەو کەسەی تەوبە ئەکات لە تاوان کردن وەکو ئەو کەسە وایە کە هەر تاوانی نەبێت ، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ وهو الذي يقبل التوبة عن عباده و يعفوا عن السيئات ﴾ الشورى/٢٥. واتە: خوای گەورە تەوبە وەردەگرێت لەبەندەکانی و لەتاوانەکانیشیان خۆش دەبێت، لەشوێنێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ فأولئك يبدل الله سيئاتهم حسنات ﴾ الفرقان/٧٠. واتە: ئەوانە کردارە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێ بەخێر و چاکە، بەومەرجەی نەگەڕێنەوە جارێکی تر بەسەر ئەوهەڵانەدا نەچنەوە، وەپێویستیشە تەوبە بەهیچ شێوەیەک دوانەخرێت، چونکە تۆ ئەجەلەکەت دیاری نەکردوەو نایزانی، لەبەرئەوە نازانی کەی مردنت پێ دەگات وەکو ئەوشاعیرە عەرەبەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| يا من بدنياه إشتغل | قد غره طول الامل |
| أولم يزل في غفلة | حتى دنا منه الاجل |
| الموت يأتي بغتة | والقبر صندوق العمل |
| إصبر على أهوالها | لا موت إلا بالاجل [7] |

---

* مەبەست لە مەکری خەڵکی واتە فێڵ و تەڵەکە و پیلان(کە ئەمەش سیفەتی کەم و کورتیە). بەڵام بەکارهێنانی وشەی مەکر بۆ خوای گەورە مەبەست پێی:

١) سزای خوای گەورە و تەدبیرێکی دامەزراو.

٢) ئاگاداری خوای گەورە بە پیلانەکانیان(وە ئەم مەکرەش سیفاتی کەماڵە بۆ خوای گەورە).

(٦) الجامع الصغير /م/٢ ص٦٨٠.

(٧) الإستعداد ليوم الميعاد/ ص٣١ لابن الحجر العسقلاني.

واتە: ئەی ئەوکەسەی کە بەدونیاوە سەرقاڵ بویت و هیوا دریژی (طـول الأمـل) لەخشتەی بردویت، تۆبێ ئاگای هەتا ئەجەلت لێ نزیک دەبێتەوە، وەمردنیش بەکتوپڕی دێت و گۆڕەکەت دەبێتە سندوقی کردەوەکانت، وەهیچ کەسێکیش نامرێت هەتا ڕۆژی تەواو نەبێ

جا کاتێک ئەم ڕونکردنەوەیەت لەم بارەوە خوێندەوە، واتە لەبارەی (ئیستیمناء)ەوە، ئەوجا بەپشتیوانی خوای گەورە بەخۆتا بچۆرەوە، ئەگەر خوا نەخواستە ئەو کارەت کرد بوو، ئەوە تەوبە بکە مەگەڕێرەوە سەر ئەو تاوانەو وازی لێ بهێنە و دوورکەوەرەوە لێ ی و داوای لێخۆش بوون بکە لە خوای پەروەردگار، خۆ ئەگەر دوور بووی لەم کارە سوپاسی خوا بکە کە پاراستوتی لەم کردارە دزێوە ناسروشتی‌یە هەرگیز هەوڵ مەدە بۆ کردن و بیر لێ کردنەوەی چونکە ئەنجامدانی ئەم کردارە لە کۆتایی‌دا چەندەها کاری خراپ لەلەشدا بەجێ دەهێڵێ، (بە پشتیوانی خوای گەورە لەبەشە زانیاری‌یەکەدا، بەدرێژی ئەم ڕاستی‌یەت بۆ دەردەکەوێت).

<u>*ئێستاش دێینە سەر چۆنێتی بڕگەکانی باسەکەمان:*</u>

١- پێناسەیەکی ئیستیمناء.

٢- حوکمی ئیستیمناء لەفەرمایشی پێغەمبەردا(ﷺ).

٣- حوکمی ئیستیمناء لەلایەن توێژەرەوانی قورئانەوە.

٤- حوکمی ئیستیمناء لەلایەن هەندێ لەزانا فقهی‌یەکانەوە.

٥- بەکورتی ڕای زاناکان و فوقەهاکان.

٦- زەرەر و زیانەکانی ئیستیمناء بەشێوەیەکی زانیاری تازە.

٧- چارەسەرکردنی ئەم کردارە لەڕێگەی شەرعی‌و پاشان زانستی.

جا هەر کاتێک ئەم باسە بە تێر و تەسەلی خوێندرایەوە و بەووردی سەنجی درایە ئەوکاتە هەموو کەسێک بۆهەریەکێ لەو حاڵەتانەی کەتیایدا باسکراوە خۆی ئەتوانێ حوکم بدا بەسەر خۆیدا بۆ کردنی یان نەکردنی، وەئایا لەچ کاتێکدا پەنا ئەبرێتە بەر ئەم کردارە؟!

وەلە چ کاتێکدا ئەنجام دانی تاوان و گوناهـ نی‌یە؟!

وەلەچ کاتێکدا بەگوناهووتاوان ئەنوسرێت؟!

وەئایا چارەسەر کردنی ئەم کردارە ناسروشتی‌یە بەچی ئەکرێت؟!

گەنجی موسڵمان چۆن خۆی لێ بپارێزێت؟!

ئەو شوێنەوارە خراپانە چی‌یە کە لە ئەنجامی کردنی ئەم کارەوە بەجێ دەمێنێ؟!

وەئایا ئەنجام دانی ئەم کردارە زەرەرو زیانی هەیە بۆ پاشارۆژی خێزان پێکەوەنان؟

وەئایا کاریگەریتی هەیە بۆ منداڵ نەبوون؟!

وەئایا چ شوێنەوارێک بەجێ دەهێڵێ بۆکاتی پیری؟!

ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر...

بەپشتیوانی خوای گەورە لەم نوسراوەدا وەڵامی پڕاو پڕ و بەپێزت دەست ئەکەوێت.

لەکۆتایی ئەم دەروازەیەدا داوا لەخوای گەورە ئەکەین کە پشت و پەنامان بێت و سەرکەوتومان بکات لەکارەکانماندا و تەنها بۆ ڕەزامەندی ئەوبێت **﴿ وما أسألكم عليه من أجر إن أجري إلا على رب العالمين ﴾** الشعراء/١٣٩.

محرم الحرام ١٤٠٧هـ

أيلول ١٩٨٦م – **سليمانى**





# پێناسەکردنی (ئیستیمناء)

<u>**ئیستیمناء**</u>

**دیارە پێناسەکردنی ئەم کردارە ڕوون و ئاشکرایە بەواتای (مەنی) [8] هێنانەوەی مرۆڤ لەڕێگەی دەستی خۆیەوە یان هەر ئەندامێکیەوە بەبێ ئەوەی پێک گەیشتنی خێزانی شەرعی دروست بووبێت.**

**وەبەکارهێنانی ئەم دەستورە نهێنیيە(العادة السرية) زیاتر لەلایەن کوڕو کچی گەنجەوە پەنای دەبرێتە بەر، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەلایەن کوڕانەوە ڕێژەی کردنەکەی زیاترە، وەک لەلایەن کچانەوە. ئاوی(مەنی) پیاو و ئافرەت* کاتێک ئارەزووی جینسیيان جوڵا ئەوا زۆر**

---

(٨) (مەنی) یەکێکە لەو جۆرە ئاوانەی کە لەعەورەتی پیاو و ئافرەتەوە دەردەچێت و هەر لەم جۆرەشیاندا (غوسلی) خۆشۆرینی ئەکەوێتە سەر.

* ئاوی مەنی پیاو و ئافرەت بەم قۆناغانەدا دروست دەبێت:

- صلب: بریتیيە لە بڕبڕەی پشت.

- ترائب: بریتیيە لە ئێسقانی سنگ- واتە: هەردووکیان پێکەوە نزیکە لە قەراغی لای خوارەوەی دیواری سنگ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای زانستی کۆرپەلەزانی دەربارەی پێکهاتن و دروست بوونی باتوو (هێلکە گون)ی پیاو و هێلکەدانی ئافرەت شتێکمان بۆ دەردەکەوێت کە ژیری تیایا سەرسام دەبێت. چونکە لە هەفتەی شەشەم و حەوتەمی ژیانی کۆرپەلەدا لەسەر هەردوولای بڕبڕەی پشتی شتێک دروست دەبێت کە لە بەشێکی گورچیلە و کۆئەندامی مێز دروست دەبێت و لە بەشێکی تری باتووی پیاو و هێلکەدانی ئافرەت دروست دەبێت.

کەوابوو هەرکام لە تۆ و هێلکەدان لە سەرەتایی پێکهاتنیاندا لە پەنای گورچیلەدان و ئەکەونە بەینی پشت و پەراسووەوە واتە نزیکە ناوەڕاستی بڕبڕەی پشت لە حاستی پەراسووی خوارەوە.

یەکێک لەو بەڵگانەی ڕاستی ئەم بیردۆزەمان بۆ ئەچەسپێنێ ئەوەیە کە باتووی هێلکەدان لە شاڕەگێک خوێن وەردەگرێت کە لقێکە لە شاڕەگی لە حاستی گورچیلەکەدا لە بەینی بڕبڕە و پەراسوودا وە فەرمان لەو-پەیە-عصب- وەردەگرێت بەستراوە بە نوخاعەوە لە بەینی پەراسووی یازدەهەم و دوازدەهەمدا و شوێنی هەموو ئەمانەیشی لەشدا لەبەینی بڕبڕەو پەراسووەکانیدایە، بەهۆی ئەوەی باتو و هێلکەدان لە پێکهاتنیاندا و لە وەرگرتنی خوێنداو ڕێک خرانی کاروباریان دا بە (اعصاب) پەیوەندی بەهێزیان بە شوێنێکەوەیە کەوا لە بەینی بڕبڕەو پەراسووکاندایە- بەهۆی ئەمەوە باش ڕاستی فەرموودەکەی قورئان دەردەکەوێت، کە زانست بە تازەیی بۆی ڕوون بۆتەوە دوا سیانزە سەدە لە هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز. جا هەر کام لە باتو و هێلکەدان دوای گەشەی تەواو دادەبەزن بۆ شوێنی ئاسراوی خۆیان- تا باتو دائەبەزێ بۆ بەر گەدە و هێلکەدانیش دائەبەزێت بۆ حەوز لە پەنای-بوروقی- منداڵاندا. جاری وایش هەیە ئەم دابەزینە دروست نابێت بە تەواوی- باتو- ئەوەستێت لە ڕێی دابەزینیدا و نایەتە شوێنی خۆی لەبەر گەدەدا ئەوسا پێویستی بە کرداری نەشتەری گەری هەیە تا بگاتە شوێنی سروشتی خۆی.

بە کورتی هێلکەدان و باتو لە پێشا لە بەینی بڕبڕەو پەراسوودا پێکهاتوون دوایش خوێن و فەرمانی عصەبی هەر لەو ناوچەیەوە وەردەگرن بۆیە پەروەردگار دەفەرموێت **﴿ يخرج من بين الصلب و الترائب﴾** واتە: ئاوە هەڵقوڵاوەکەی مرۆڤی لێ دروست کراوە لە بەینی بڕبڕەو پەراسودا دەردەچێت. تفسير المراغي/ المجلد العاشر عند تفسير قوله تعالى **﴿ يخرج من بين الصلب و الترائب ﴾** الطارق.. ص١١٣/ فما بعدها.

بەخێرایی پاڵیان پێوە دەنێت بۆ کردنی ئەم کردارە ناسروشتی‌یە، بەڵام ئافرەتان کەمتر ڕێژەی ئەم کردارە بەئەنجام ئەگەیەنن، ئەمەش مانای ئەوەنیە کەئارەزووی جینسی ئافرەتان کەمتر بێت لەئارەزووی جینسی پیاوان[9]، بەڵکو وادانراوە ئارەزووی (غەریزەی جینسی) ئافرەتان لە(٧٥%) لەسەر پیاوان زیاترە. واتە ئەگەر پیاوان (٢٥) جار حەز بەوکردارە بکەن، ئەوا بێگومان ئافرەتان (٧٥) جار ئارەزوومەندی ئەو کردارەن، (نەک کرداری ئیستیمناء) بەڵکو پێک گەیشتن بە پیاوان و هاوسەرێتی ئەنجام دان، بۆ یە زاناکان ڕایان لەسەر ئەوەیە، ئەگەر بێت و ئافرەتان بەوڕێژە زۆرە حەزیان لەپیاو نەبوایە، ئەوا هیچ ئافرەتێک لەم جیهانەدا هەرگیز بەئاسانی خۆی نەئەدا بەدەست پیاوەوە، چونکە پیاو کاری(جووت بوون)ی خۆی بەئەنجام ئەگەیەنێ و هیچی تر، بەڵام شوێنەوارێکی قووڵ وناخۆش بۆ ئافرەتەکە جێ ئەمێنێ، ئەوەیش لەدواییدا منداڵ بوون و ئازارەکانی(حیض) و (نفاس)ە، کەلەکاتی منداڵ بوون و دوای منداڵ بوون ڕووبەڕوی ئەبێتەوە و پاشانیش هەروەها خزمەتکردن و پەروەردەکردن و پارێزگاری لە منداڵ.

(دیارە جیاوازی سایکۆلۆژیەتی ئافرەتان لە زۆر ڕووەوە جیاوازە لەپیاوان کە ئەمە یان باسی ئێمە نی‌یە لێرەدا).

لە زمانی عەرەبیدا (ئیستیمناء) بە پێنج ناو هێنراوە کە هەموویان هەر بە واتای (ئیستیمناء) دێن، کەئەمەش ناوەکانیانە:

١) (ئیستیمناء) ( زانایان بە گشتی و زانایانی عیراقی هەر بەم ناوەوە ناوی دێنن، بۆیە منیش زیاتر ووشەی (ئیستیمناء) بەکار دەهێنم، چونکە ئەو ناوە زەقەی ڕۆژانە گەنجەکان بەکاری دەهێنن ووشەیەکی ناخۆشەو جوان نی‌یە لە کتێبدا بەکار بێت.

٢) الناکح ید: واتە: ئەو کەسەی لەگەڵ دەستی خۆی جووت دەبێت.

٣) العادة السرية (دەستوورێکی نهێنی) کە زیاتر کتێبە جینسی‌یەکان ئەم ناوە بەکار ئەهێنن لە نوسینەکانیاندا.

٤) عميرة - حلب عميرة (زۆر بەکەمی ئەم ناوە هاتووە) واتە: هەڵ دۆشینی مەنی پیاو.

---

(٩) بڕوانە (منداڵ لە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاریدا) ل١٠١/ ١٩٨٣ دانراوی (خلف جلال ژاژلەیی).

٥) الخضعة: (زۆر بەکەمی ئەم ناوەش هاتووە، کە خۆم ئەم دوو ناوەم هەر لەدوو سەرچاوەدا بینیوە، کە ئەویش تەفسیری (قرطبي) و تەفسیری (روح المعاني للآلوسي) یە.

کەواتە: هەرکاتێك یەکێك لەم ناوانەت بینی ئەوا بزانە هەریەمانای (ئیستیمناء) دێت.

ئێمە لەم باسەماندا تیشك ئەخەینەسەر شیکردنەوەی (٣) ئایەتی قورئانی پیرۆز کەلە دوو سورەتدا هاتوون و دووبارە بۆتەوە، ئەویش سورەتی (معارج) و (مومنـــون)ە، دواجار (٣) فەرمودەی پێغەمبەری ئازیز وەرئەگرین، ئەگەرچی هەر سێ فرمایشتەکە بە لاوازی (ضعیف) هاتوون، پاشان دەچینە سەر توێژینەوەی بیروڕاو بۆچوونی توێژەرەوانی قورئان واتە (مفسرین) و ڕای زاناکان و فوقەهەکان لەو بارەوە، دوایی دەچینە سەر بەشی پێنجەمی باسەکەمان لە ژێر تیشکی بیروبۆچوونی زانا عیلمانیەکان و کتێبە جینسیەکان و چۆنێتی دیاری کردنی زەرەرو زیانەکانی بەشێوەیەکی زانستیانەی سەردەم، کەهەر لەو کتێبە جینسیانەدا دیاری کراوە، بە ئومێدین خوای گەورە بیکاتە توێشووی (قیامەت) و سوود و قازانج لێ وەرگرتنیشی ببێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە.

*إنه نعم المولى ونعم النصير.*



# بەشی یەکەم

## حەرام کردنی (ئیستیمناء) لە لایەن توێژەرەوانی قورئانی پیرۆزەوە

## (تحريم الإستنماء عند المفسرين)

***لەوانە:***

١- تەفسیری نەسەفی . عبدالله بن أحمد بن محمد النسفي.

٢- تەفسیری (إبن كثير) .. إبن كثير.

٣- تەفسیری هەردوو پێشەوا جلالين .. جلال الدين السيوطي و جلال الدين المحلي.



٤- تەفسیری قرطبي .. أبي عبدالله محمد بن الأنصاري القرطبي.

٥- تەفسیری روح المعاني للآلوسي .. شهاب الدين السيد محمود الآلوسي البغدادي.

٦- تەفسیری (الكبير) للإمام الرازي (أبا عبدالله محمد بن عمر بن حسين القريشي).

٧- تەفسیری في ظلال القرآن .. سيد قطب.

---

*خوای گەورە لە سورەتی (المؤمنون)دا ئەفەرمویت:*

**﴿والذين هم لفروجهم حافظون(٥) إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين(٦) فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون﴾** المؤمنون/ ٥-٦-٧.

*واتە:*

**﴿ والذين هم لفروجهم حافظون ﴾** ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن. **﴿ إلا على أزواجهم ﴾** مەگەر تەنها لەگەڵ هاوسەری شەرعی خۆیان نەبێ یان، **﴿ أو ما ملكت أيمانهم﴾** لەگەڵ کەنیزەکێک (جاریە) کە بوو بن بە خاوەندیان، **﴿فإنهم غير ملومين ﴾** بێگومان ئەوانە سەر زەنشت (لۆمە) کراو نین لەسەریان واتە نەنگی و تەشەر و تاوان ڕوویان تێ ناکات، چونکە لە ڕێگای شەرع لایان نەداوە، ویستویانە لەڕ ێیەکی شەرعی‌یەوە نەوەو منداڵ بخەنەوە بۆ کۆمەڵ و گەل **﴿ فمن إبتغى وراء ذلك ﴾** هەرکەسێک لەسنوور دەرچێت واتە جگە لەم دوانە سەرجێ کردن و کاری حەرام ئەنجام بدات یان لەگەڵ ئافرەتانی تردا، یان جووت ببێت لەگەڵ گیاندار، یا لەپاشەوە لە ڕێگەی (کۆمی) خێزانی خۆی دروست ببێ، وە یا بەدەست خۆی ڕەحەت بکات (ئیستیمناء) **﴿ فأولئك هم العادون ﴾** ئەو کەسانە ستەم کارن و لە ڕێی ڕاست لایان داوە و لە سنوری شەرعی خوای پەروەردگار دەرچوون.

دەبا ئێستا بەیەکەوە سەردانێکی گوڵ و گوڵزاری تەفسیرە زۆر باوەڕ پێکراوەکانی قورئانی پیرۆز بکەین و بزانین ئەو زانا بەڕێزانە چۆنیان تەفسیر کردووەو ڕاوبۆچوونیان چی‌یە؟ فەرموون:

*١) تەفسیری نەسەفی:*

لەتەفسیری (نەسەفی)دا (خوای لێ ڕازی بێ) لەبارەی ئەم ئایەتەی کە ئێستا شیمان کردەوە واتە **﴿والذين هم لفروجهم حافظون... فأولئك هم العادون﴾** ئەفەرمویت (أي طلب



قضاء شهوة من غير هذين -أي الزوجة وملك اليمين- وفيه دليل تحريم الإستمناء بالكف لإرادة الشهوة) [10].

**واته: ئەم ئایەتە پیرۆزانە دەری دەخەن، کە هەر کەسێک بیەوێت ئاوی(مەنی) خۆی بەدەست بهێنێتەوە، بێجگە لە ژنی حەڵاڵی خۆی و کەنیزەکەکەی، ئەوا بەر دوا برگەی ئایەتی ﴿ فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون ﴾ ئەکەون و پێی گوناهبار و تاوانبار ئەبن، جا دوایی ئەفەرموێت** (وفيه دليل على تحريم الإستمناء بالكف لإرادة الشهوة).. **واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە لەسەر حەرام کردنی ئاوی خۆ هێنانەوە بەدەست بەمەبەستی ئارەزوو شکاندن، کەواتە ئەگەر وای کرد بەر هەڕەشەی ﴿ فأولئك هم العادون ﴾ دەکەوێت.. واتە: ئەوانە لە سنووری شەرع و ڕێبازی خوا لایان داوە.**

***٢) تەفسیری (ابن كثير):***

**لە تەفسیری (ابن كثير)دا هاتووە و ئەفەرموێت:**

(وقد إستدل الإمام الشافعي (رحمه الله) ومن وافقه على تحريم الإستمناء باليد هذه الآية الكريمة: **﴿ والذين هم لفروجهم حافظون.. الى قوله.. هم العادون ﴾** [11].

**واتە: ئیمامی شافیعی بۆ حەرام کردنی (ئیستیمناء) بەڵگەی بەئەم ئایەتە پیرۆزە هێناوەتەوە، بەو واتایە، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر حەرام کردنی (ئیستیمناء).**

***٣) تەفسیری هەردوو پێشەوا ئیمام (الجلالين):***

**لەتەفسیری (الجلالين)دا هاتووە و دەفەرموێت:**

**﴿ فمن إبتغى وراء ذلك﴾** أي من الزوجات والسراري كالإستمناء باليد في إتيانهن **﴿فأولئك هم العادون﴾** المتجاوزون الى ما لا يحل لهم [12].

**واتە: کە فەرمووی ﴿فمن إبتغى...﴾ ئەوانە بێجگە لە خێزانەکانی خۆیان و کەنیزەکەکانیان بۆیان نییە کەبەهیچ شێوەیەکی تر (مەنی) خۆیان بهێننەوە، کە یەکێ لەوانە (ئیستیمناء) یە، وەهەروەها ﴿ فأولئك هم العادون ﴾ هەردوو پێشەوا* بەم شێوەیە تەفسیریان کردوە کەدەفەرمون ئەم کارە لادان و دەرچوونە لەسنووری شەرع.**

---

(١٠) تەفسیری (النسفي) المجلد/٣ ص١١٤ للإمام/ عبدالله بن أحمد بن محمود النسفي(رحمه الله).

(١١) تفسير القرآن العظيم - المجلد٣- ص٢٣٩ لإبن كثير.

(١٢) تفسير الجلالين - ص٢٨٥ - للإمام الجلالين.

* (جلال الدين السيوطي)- جلال الدين الرومي.

### ٤) تەفسیری ئیمامی (قرطبي):

لە تەفسیری (قرطبي)دا هاتووەو ئەفەرموێت:

(قال محمد بن الحكم: سمعت حرملة بن عبد العزيز قال: سألت مالكا عن الرجل الذي يجلد عميرة، فتلا هذه الآية: ﴿ **والذين هم لفروجهم .... الى .. فأولئك هم العادون** ﴾ [١٣]..

واتە (محمدی کوڕی حەکەم) دەڵێ: گوێم لە (حەرمەلەی کوڕی عبدالعزیز) بوو، ووتی: پرسیارم لە مالک کرد دەربارەی پیاوێک کە دارکاری ذەکَری خۆی بکات ئەویش ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: واتە: بەر ئەم ئایەتانە کەوتووەو حوکمی خوای بەسەردا جێ بەجێ کراوە.

### ٥) تەفسیری (روح المعاني للآلوسي):

لە تەفسیری (روح المعاني)دا هاتووەو دەفەرموێت:

(وكذلك أختلف في إستمناء الرجل بيده يسمى (الخضضة) و (طلب عميرة) فجمهور الأئمة على تحريمه وهو عندهم داخل فيما ﴿ **فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون** ﴾ [١٤].. واتە:

**وە هەروەها جیاوازی و ڕای جۆر بەجۆر هەیە لەبارەی حوکمی (ئیستیمناء)ەوە کە مرۆڤ بەدەستی خۆی (مەنی) یەکەی بهێنێتەوە، کەپێی دەوترێت (الخضضة) و (طلب عميرة)، هەموو زاناکان و ئیمامە موجتەهیدەکان لەسەر ئەوەن کە کردنی ئەم کردارە ناسروشتیەو حەرام و قەدەغەیە، چونکە ئەکەوێتە بەر هەڕەشەی ئایەتی ﴿ فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون ﴾.. واتە: ئەوانەی بێجگە لە خێزانەکان و کەنیزەکەکانیان بەهەر ڕێگەیەکی تر (مەنی) خۆیان بهێننەوە ئەوە تاوانبار ئەبن و بە گوناهـ ئەنوسرێت لەسەریان.**

***هەر لەتەفسیری (روح المعاني)دا هاتووەو دەڵێ:***

(وأحمد بن حنبل على ورعه يجوزه ويحتج بإخراج فضلة من البدن فجاز عند الحاجة، وأصله: الفصد[١٥] والحجامة [١٦] وعامة الفقهاء على تحريمه) [*].. **واتە: ئیمام (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) بۆ کاتی زۆر پێویست ڕێگەی داوە، کە وەکو (خوێن گرتن و کەڵە شاخ گرتن) بێت، وە هەموو شەرع زانەکان (فقهاء) پێکە هاتوون و یەکدەنگن (متفقــن) لەسەر حەرام کردنی ئیستیمناء.**

---

(١٣) تفسير القرطبي / الجلد ١٢ ص١٠٥-١٠٦..

(١٤) تفسير روح المعاني للآلوسي – الجلد ١٨ ص١٠..

(١٥) الفصد: أخذ الدم من الرأس: واتە: گرتنی خوێنی زیادەو پیس لە سەر.

(١٦) الحجامة: أي أخذ الدم من أي عضو: واتە: گرتنی خوێنی پیس لەهەر کوێیەکی لەشدا بێ.

(*) تفسير روح المعاني – الجلد١٨ – ص١٠ – للآلوسي.

قال الإمام هيمام: (يحرم فإن غلبته الشهوة ففعل إرادة تسكينها به فالرجاء أن لا يعاقب) [١٧]..

واته: كردنی ئیستیمناء حەرامە، بەلام ئەگەر یەكێك شەهوەتەكەی زۆری بۆ هێناو پالەپەستۆی لەسەر دروست كرد، ئەوە دروستە بۆی كە ئیستیمناء بكا بۆ ئەوەی ئارەزووەكەی دابمركێتەوە و ئەوەندەی تر هەست و بیری پێوەی سەرقال و مەشغول نەبێت، نەك بكرێت بە عادەت و بەردەوام بێت لەسەری، ئەگەر بۆ كاتێكی ئاوا پێویست بوو، ئەوە ئومێد وایە كە بە گوناه نەنوسرێت چونكە وا ئەبێت هەندێك جار مانەوەی ئەو (مەنی)یە زۆرە لەلەشی مرۆڤدا ببێتە هۆی ناڕەحەتی و ئازار دروستكردن لە خودی مرۆڤەكە خۆیدا.

٦) تەفسیری (الكبیر):

لەتەفسیری (الكبیر) ی (ئیمامی ڕازی)داهاتووە و دەفەرموێت: (والإستمناء باليد لايشرع فيها إلا التعزير)[١٨] واتە: ئەوانەی كە(ئیستیمناء) ئەكەن داری حەدیان لەسەر نیە، تەنها ئەوەندە نەبێت كە ئەتك(إهانة) ئەكرێن، بۆ ئەوەی دەست لەو كارە ناڕەوایە هەلگرن و وازی لێ بهێنن.

٧) تەفسیری (في ظلال القرآن):

مامۆستای شەهیدی ئیسلام (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەكاتی تەفسیر كردنی ﴿ **والذين هم لفروجهم** ....إلى ...**فأولئك هم العادون** ﴾: ئەفەرموێت: ئەم ئایەتانە وانیشان ئەدەن كەئیسلام كۆمەلی پاك وبێگەرد ڕەوشت بەرز ئەبێ، كۆمەلێك كەبەبێ فروفێل هەموو پێوەسنیەكی سروشتی تیا بەجێ بهێنرێ، بەلام بەبێ بەربەرەلایی و پێچ و پەنایەك كەعەرەقی ناوچەوان بتكێنێ، كۆمەلێك بوەستێ لەسەر دروست كردنی خێزانی شەرعی بەهێزی بەتین، وەلەناو خانوویەكی ئاشكرا لەگەرەكا، كەهەمووكەسێك بلێ ئەمە خانووی فلانە كەسە، كۆمەلێك كەهەموو منداڵێك باوكی خۆی تیا بناسێتەوە، و شەرمەزار نەبێ لەبوونی خۆی، ئەم شەرمەزار نەبوونەشی لەبەر ئەوە نەبێ كەشەرم و حەیای باری كردبێ، بەلكو لەسەر ئەوە بێ كەپەیوەندی ژن و پیاو لەسەر بناغەیەكی ڕێك و پاك و خاوێن و هەمیشەیی و ئامانجداریی بێ، وەبیەوێ پێویستیەكی ئادەمیتی و كۆمەلایەتی -

---

(١٧) تفسير روح المعاني - المجلد١٨ - ص١٠ - للآلوسي.. بۆ زیادە شارەزابوون لە كەلەشاخ گرتن بڕوانە: الفقه السنة - م١- ص٣٩٠ .. وە بڕوانە الطب النبوي - ص٣٨-٤٨..

(١٨) تفسير الكبير/ المجلد/٢٣ ص١٢٣ لأمام الكبير الفخر الدين الرازي.

الإجتماعی- بەجێ بێنێ، نەک بۆ کەیف و خۆشی [19] دیارە لەتەفسیرەکانی تریشدا هەرئاماژە (إشارة) بۆ ئەم مەسەلەیە کراوە، بەلام بەپێویستم نەزانی ئەوانیشی بۆ وەربگرم، بۆ زیادە شارەزا بوون خۆت دەتوانی تەماشای ئەم تەفسیرانەی تر بکەیت کەلەپەراوێزەوە ئاماژەی بۆ ئەکەین[20].

لێرەدا ئێستا زۆر بەڕوونی ڕاو بۆچوونی توێژەرەوانی قورئانمان بۆ دەرکەوت، کەهەموویان بۆ حەرام کردن و قەدەغەکردنی ئیستیمناء پەنایان بردۆتە بەر ئەو ئایەتانەی سورەتی( المعارج ) و ( المؤمنون ) کەماناکەیمان بەکوردی شی کردەوە، کەواتە لەلایەن توێژەرانی قورئانەوە هیچ بوارێک نیە بۆ کردنی ئەم کردارە ناسروشتیەو، زۆر بەتوندی دژی وەستاون.

ئێستاش دێینەسەر (بەشی دووەمی) باسەکەمان، کەتیشک خستنەسەر( ٣ ) فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) کەوەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد کە فەرمودەکان بەلاوازی هاتوون.

---

(١٩) في ظلال القرآن/ المجلد/٨/ ص٢٨٤ سيد قطب.

(٢٠) ١- تفسير البيضاوي/ص٣٩٥.

٢- تفسير القرآن الكريم/ص٢٦٣.

٣- تفسير مختصر لأبن كثير/محمد علي الصابوني/م/٣.

٤- تفسير الخازن. علاء الدين الصوفي البغدادي.

٥- تفسير الكشاف/ لزمخشري.

٦- تفسير حاشية الصاوي/على تفسير الجلالين.



# بەشی دووەم

## حەرام کردنی ئیستیمناء لە فەرمودەی پیغەمبەردا ﷺ

## - تحريم الإستمناء في حديث الرسول-

لـەبارەی حـەرام کردنـی (ئیسـتیمناء) لەفـەرمودەی پیغەمبـەردا(ﷺ) ئیمـە(٣) فەرمایشـتمان بـەرچاو کـەوتووە، لەوانەیـە فەرمایشـتی زیـاتریش هـەبیت، بـەلام ئـەم سـێ فەرمایشتەش لەبۆچوونی زاناکانەوە وادەرئەکەویت کەبەلاوازی هاتبن و زۆر جیگای پشت پـێ بەستن نەبن، بەلام لەهەمان کاتیشدا ئەمە لەبەهاو خودی باسەکەمان کـەم ناکاتـەوە و نابیتـە مایەیحـەلال کردنـی ئـەم کـردارە، چونکـە زاناکـان بـۆ قەدەغـەکردنی ئـەم کـردارە پشـتیان بەفەرمایشتی پیغەمبەر(ﷺ) نەبەستوە بەلکو لەزۆربەی تەفسیرەکانیشدا هەر ئاماژە بۆ ئەوە نەکراوەکە فەرمایشت(حديث) هەبیت لەم بارەوە، چونکە ئایەتەکان زۆر بەروونی ئەتکی ئەم کارە دەکەن و پیویست بەهیچ (تەئویلیکی) ناڕەوا و نادروست ناکات، چونکە کەپـەروەردگار ئەفـەرمویت: ﴿ **فمـن إبتغـى وراء ذلـك فـأولئك هـم العـادون** ﴾ ڕوون و ئاشـکرایە کەهـەموو کاریکی تری ناپەسەند و ناڕەوا ڕەت ئـەکا تـەوە کەببیتـە مایـەی(مـەنی) هینانـەوەی مـرۆڤ بیجگە لەخیزانی شەرعی و کەنیزەکەکەی، کەواتە ئەوەی ئیتر لەم دوانـە بـترازێ ئـەوە﴿ **فمـن إبتغى وراء ذلك** ﴾ەیەو زۆر پیویستە بەخۆیدا بچیتەوەو، واز لەهـەموو کـاریکی نـاڕەوا بینـێ کەلەسنوری شەرع دەری ئەکات، دیارە ئەو زانـا بەڕیزانـەی کەهـەموو دەم پابـەندی فـەرمانی خـواو پیغەمبـەری خـوادا بـوون و هـەردەم خـاوەنی خوڕەوشـتی جـوان و ئاکـاری مەردانـە و سەرقاڵ بوون لەئایەت و لەفەرموودەی پیغەمبەردا، ئیمە ناتوانین بەئەوان بلیین: نەخیر ئیـوە نایزانن و ئیمە دەیزانین، کە ئەگەر بـەراوردی عیبـادەت و خواپەرسـتی و تـەقواو شـەونویژ و هەلویستە بەرزەکانیان بکەین لەگەڵ خۆماندا، ئەواجیاوازیان بەقەدەر ئاسمان و ڕیسمانە، ئەو زانـا بەڕیزانـەی شـەووڕۆژیان سـەریەک نـابوو، بـۆ ڕۆچـوون بـەناو دەریـای حیکمـەت و گەورەیی‌ئایەتەکانی خوای پـەروەردگاردا، هـەرگیز نـاگونجێ ئەوانـە بەسـەر هەلـەی گـەورەدا ڕۆیشتبن و هەروا بەئاسانی لییان نەکۆلرابینەوە، پیاوانی وەکـو ئیمـامی شـافیعی و ئیمـامی حەنەفی و ئیمامی‌مالیکی و ئیمامی حەنبەلی کەئەوانە پیشـەوای ئیمـەن لـە ڕوون کردنـەوە و

ئی‌کردنەوەی ئایات و فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا، ئێمە هەرگیز ناتوانین زۆرانبـازی لەگـەڵ ئەمانە بکەین و خۆمان لەئەوان بەزاناتر بزانین وڕای خۆمان هەڵبژێرین بەسەرڕایە بەهێزەکەی ئەواندا کە ئەوان ویڕای ئەوەی بەهەزارەها فەرمایشتی (صحيـــح) یـان لەبـەر بـووە لەهـەمان کاتیشدا هەزارەها فەرمایشتی( ضعيف ) و بێ هێزیشیان هەر لەبەر بـووە، بـۆ ئـەوەی نـەوەکو خوانەخواستە فەرمایشتێکی بێ هـێز بـە بـەهێز دابنێـن و حوکمـی لەسـەر بکـەن و پاشـان لەسەری تاوانبار وگوناهبـار بـن، ئـەوان قیامـەتی خۆیـان زۆر خۆشـتر ویسـتووە وەک لـەوەی لەدونیای تۆدا بەبێ هیچ پاداشتدانەوەیەک بیانەوێت تۆ بەهەڵەدابەرن و بەناڕەوا کارێکت پـێ بکەن کەرازی‌بوونی خـواو پێغەمبەرەکـەی لەسـەرنەبێت، نـەخێر ئـەوە لـە بەرنامـەی پـیرۆزی ئەوانەوە زۆر دوورە، لەبەر ئەوە پێویستە زۆر ڕێز لەو راو بۆچوونانەی ئـەو زانـا پایـە بەرزانـە بگرێت و بەچاوی حورمەتەوە سەیریان بکرێت رای بـیرو هۆشـی کـەم و کورتـی خۆمـان فـەرز نەکەین بەسەر ڕای بەهێزو وورد بینانەی ئەواندا[٢١] . لەبەر ئەوەی ئـێرە جێگـای ئـەم باسانە نی‌یە ناتوانین نموونە بهێنینەوە لەسەر تەقواو زوهدو خۆ بەکەم زانـین و زانـایی ئـەو پێشـەوا بەرێزانە، لەبەر ئەوە دەتوانرێت سەیری ئەو کتێبانە بکرێـت کـە بـەدرێژی باسـی ئـەو پێشـەوا بەرێزانە ئەکات، جائەوکاتە زۆر بەچاکی تێدەگەین کەئەو پیاوانە چ کەڵەپیاوانێکی سـەردەمی خۆیان بوون ! !.

***ا) فەرموودەی یەکەم:***

عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) عنه النبي(ﷺ) أنه قال: قال رسول الله(ﷺ): **(سبعة لاينظـــر الله إليهم يوم القيامة ولا يزكيهم ولا يجمعهم مع العالمين، ويدخلـــهم النـــار أول الداخلـــين، إلا أن يتوبوا، ومن تاب، تاب الله عليه، الناكح يده، والفاعل و المفعول به، ومدمن الخمر و الضـــارب والديه حتى يستغيثا، و المؤذي جيرانه حتى يلعنـــوه، و النـــاكح حليلـــة جـــاره)** [٢٢] ... واتـە: لەئەنەسەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: حەوت جۆرە کەسان هەن کەخوای گـەورە لـەرۆژی

---

(٢١) بروانە الأئمة الأربعة/ دلنراوی/ دکتۆر أحمد الشرباصی.

(٢٢) الكبائر/ ص٣٧/ للإمام الشمس الدين/ و قرطبية ص٢٧/ رواه البيهقي في شعب الايمان، و الحسن بن عرفة في جزئه.



دواییدا بەچاوی سۆزو بەزەیی و رەحمەتەوە تەماشایان ناکات (ولایزکیهم) وەلەو تاوانانەش پاکیان ناکاتەوە(ولا يجمعهم مع العالمين) وە لەگەڵ خەڵکانیشدا کۆیان ناکاتەوە و بەتوندتر لێپرسینەوەیان لەگەڵ ئەکات (ویدخلهم النار أول الداخلين) لەپێش هەموو کەسدا دەیان خاتە ناو ئاگرەوە(إلا أن يتوبوا) تەنها ئەوانە نەبێت کە تەوبە دەکەن (ومن تاب تاب الله عليه) هەرکەسێك لەدونیادا تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، ئەوا خوای گەورە لێی وەرئەگرێت.

١- *الناكح يده:* ئەو کەسەی لەگەڵ دەستی خۆیدا جووت دەبێت واتە ئیستیمناء کردن.

٢- *الفاعل:* ئەوانەی کەنێربازی دەکەن(اللواطة) [٢٣].

٣- *المفعول به:* ئەوانەی کە نێر بازیان لەگەڵ دەکرێت.

٤- *ومدمن الخمر:* ئەوانەی کەبەبەردەوامی ئارەق ئەخۆنەوە و وازی لێ ناهێنن[٢٤].

٥- *والضارب والديه حتى يستغيثا:* ئەو کەسانەی کە لە دایك و باوکیان ئەدەن، هەتا وایان لێ دێت ئەو دایك و باوکە هاواری ناڕەزا بوونیان بەرز دەبێتەوە بۆلای خوای گەورە[٢٥].

٦- *والمؤذي جيرانه حتى يلعنوه:* ئەو کەسانەی کەئازاری دراوسێکانیان ئەدەن، تاوای لێ دێت کەنەفرەتی لێ بکەن.

٧- *الناكح حليلة جاره:* ئەوکەسانەی کە لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکانیاندا زینا بکەن.

__١) فەرموودەی دووەم:__

__پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:__ (سبعة يلعنهم الله تعالى ولاينظر إليهم يوم القيامة ويقول: أدخلوا النار مع الداخلين، الفاعل والمفعول به يعني اللواط، والناكح البهيمة والناكح الأم و بنتها والناكح يده إلا أن يتوبوا). واتە: حەوت جۆر کەسان هەن کەخوای گەورە لەڕۆژی دوایيدا بەچاوی سۆز و رەحمەوە تەماشایان ناکات، وەپێیان ئەوترێت بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەی دۆزەخین، لەوانە (الفاعل و المفعول به) نێر بازی کەرو نێر بازی لەگەڵ کراو مەبەست لە لواطة کردنە، وە(ناكح البهيمة) ئەوکەسەی زینا لەگەڵ ئاژەڵدا بکات، وە(ناكح الأم و بنتها) وەئەو کەسانەی کەدایك و کچ بەیەکەوە مارە ئەکەن و بەیەکەوە کۆیان ئەکەنەوە، (والناكح يده) وەئەوانەی کە(ئیستیمناء) دەکەن، تەنها ئەوانە نەبێت کە تەوبە دەکەن[٢٦].

---

(٢٣) بۆیە نێربازی بە(اللواط) ناوبراوە، چونکە گەلەکەی حەزرەتی(لوط) پێغەمبەر(عليه السلام) بەنێربازی بەناو بانگ بوون، وەکو خوادەفەرموێت **﴿ أئنكم لتأتون الرجال شهوة من دون النساء ﴾** النمل/٥٥.

(٢٤) حكم تحريم الخمر في الاسلام بخوێنەوە...

(٢٥) پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(ملعون من عق والديه)، واتە: ئەو کەسە دوورە لەڕەحمەتی خوا کەسەرپێچی فەرمانی دایك و باوکی دەکات تەنها لەبێ شەرعیدا نەبێت. الترغيب و الترهيب، ج/م/٣ ص٢٨٧ للمنذري رواه الطبراني في الأوسط ورجاله رجال الصحيح، إلا عمر بن هارون التميمي، و يقال فيه: محرر بالإهمال، ورواه الحاكم في رواية هارون أخي محرر، وقال: صحيح الإسناد(قال الحافظ): كلاهما واه لكن محرز قد حسن له الترمذي و ماشاه بعض، وهو أصح حالا من أخيه هارون، و الله أعلم.

(٢٦) كتاب الكبائر: ص ٦١.

له فه‌رمایشتیکی (صحیح)ی تری پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتووه‌و ده‌فه‌رموێت:

عن أبي هريرة (رضى الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: (لعن الله سبعة من خلقه من فوق سبع سماوات، وردد اللعنة على واحد منهم ثلاثاً، و لعن كل واحد منهم لعنة تكفية، قال: ملعون من عمل عمل قوم لوط، ملعون من ذبح لغير الله، ملعون من أتى شيئا من البهائم، ملعون من عق والديه، ملعون من جمع بين أمرأة وإبنتها، ملعون من غير حدود الأرض، ملعون من ادعى إلى غير مواليه) رواه الطبراني في الأوسط ورجاله ثقات ورجاله رجال الصحيح، إلا محرز بن هارون التميمي، و يقال فيه محرر بالإهمال، ورواه الحاكم من روايه هارون أخي محرر، و قال: صحيح الإسناد(قال الحافظ) كلاهما واه لكن محرز قد حسن له الترمذي، ومشاه بعضهم، و هو أصلح حالا من أخيه هارون، والله أعلم.

واته: خوای گه‌وره له‌عنه‌تی کردووه له‌حه‌وت جۆره که‌سان له‌دروستکراوانی خۆی نه‌فرینی لێیان کردووه له‌سه‌رووی حه‌وت ئاسمانه‌وه، وه‌ئه‌و نه‌فرینه ئه‌گه‌ر ڕێته‌وه‌سه‌ر هه‌ر یه‌کێک له‌و حه‌وت جۆره که‌سانه سێ جاری تریش، هه‌روه‌ها هه‌ریه‌کێک له‌و نه‌فرین لێ کراوانه ، یه‌کی یه‌ک نه‌فرین و له عنه‌یتان به‌سه بۆ ئه‌وه‌ی که شایه‌نی دۆزه‌خ بن، چ جای ئه‌وه‌ی سێ جاری تریش ئه‌و له‌عنه‌ته بگه‌ڕێته‌وه به‌سه‌ریاندا، ئه‌وانه‌ش ئه‌مانه‌ن:

١- ملعون من عمل عمل قوم لوط: نه‌فرین لێکراوه ئه‌و که‌سه‌ی کرده‌وه‌ی گه‌لی (لوط) پێغه‌مبه‌ر (عليه السلام) بکات که نێربازی‌یه.

٢- ملعون من ذبح لغير الله: مه‌لعونه و دووره له‌ڕه‌حمه‌تی خوا ئه‌و که‌سه‌ی شت سه‌ر ببڕێ بۆ جگه له خوا.

٣- ملعون من أتى شيئا من البهائم: مه‌لعونه ئه‌و که‌سه‌ی بچێته لای هه‌ر گیاندار و بێ زمانێک و (مه‌نی) خۆی پێ بهێنێته‌وه.

٤- ملعون من عق والديه: مه‌لعونه ئه‌و که‌سه‌ی ئازاری دڵی دایک وباوکی ئه‌دات.

٥- ملعون من جمع إمراءة وبنتها: مه‌لعونه ئه‌و که‌سه‌ی که دایکێک و کچه‌که‌ی به‌یه‌که‌وه ماره بکات وله‌یه‌ک کاتدا به‌یه‌که‌وه کۆیان بکاته‌وه.

٦- ملعون من غير حدود الأرض: مه‌لعونه ئه‌و که‌سه‌ی سنووری پارچه زه‌وی یه‌ک بگۆڕێت و داگیری بکات.

٧- ملعون من ادعى إلى غير مواليه: مه‌لعونه ئه‌و که‌سه‌ی به‌خه‌ڵکی بڵێ ڕۆڵ.

### ٣) فەرمودەی سێیەم:

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : ( ناكح اليد ملعـــون ) [٢٧] واتە: ئەوانەی کە ئیستمناء ئەکەن ئەوە نەفرین لێکراون ئەمە ئەو سێ فەرمایشتە بوون کە خستمانە ڕوو، ئەگەر بێت و تەماشای فرمایشتەکان بکەین ئەوا ئەبینین زۆر بەتوندی هەڕەشە لەو کەسانە ئەکات کە ئیستمناء دەکەن، ئەگەر حوکمی تەواو بەو فەرموودانە بکرێت ئەوابە هیچ جۆرێک بواری کردنی نەدراوە. خۆ ئەگەر حوکمیش بەفرمایشتەکان نەکرێت ئەوا ئەو سێ ئایەتەش کەڕوونمان کردەوە زۆر بەڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەم ڕاستیە ئەکات.



(٢٧) الدر المختار شرح تنوير الأبصار المجلد ٢ ص ٣٩٩ إسناده ضعيف.

# بەشی سێهەم

## ووتەی هەندێ لە زاناکان وفوقەهاکان دەربارەی ئیستیمناء

## -أقوال بعض العلماء والفقهاء حول الإستمناء-

*لەوانە:*

١- الدر المختار شرح تنوير الأبصار.

٢- إبن زين العابدين.

٣- شرف الدين يحيى النووي.

٤- الشيرازي.

٥- إبن همام الحنفي.

٦- محمد بن إسماعيل الصنعاني.

٧- إبن حزم الأندلسي الظاهري.

٨- سيد سابق.

٩- إبن تيمية.

١٠- الشيخ حسنين محمد مخلوف.

---

لیرەشدا بە پشتیوانی خوا ڕای هەندیک لەزانا بەرزەکانی ئیسلام وەردەگرین و شی دەکەینەوە، جا لە دوای ڕوون کرد نەوەی ڕای زاناکان و (فوقەهاکان)، ئەو کاتە وەلامی زۆربەی پرسیارەکانمان بۆ ڕوون ئەبیتەوە، هەموو کەسیک ئەو کاتە خۆی ئەتوانێ لەژێرتیشکی ئەو ڕاستی یانە دا حوکم بەسەر خۆیدا بدات، بەلام پێویستیشە ئەو حوکمەی کەدەیدات بەسەر خۆیدا بەگوێرەی شەرع بیت، نەک بەگوێرەی ئەو هەواو ئارەزووانەی کە خۆی جڵەوی بۆ شل بکات و خۆی بدات بە دەستەوەو تەسلیمی ببێ، چونکە ئەو کاتە خوانە خواستە ئەگەر خۆی دابەدەم دەریای حەزوئارەزووەکانی‌یەوە، ئەوە خوای گەورە هەڕەشە یەکی توندی لێ دەکات و دەفەرمویت : ﴿ **أفرأيت من اتخذ إلهه هواه وأضله الله على علم** ﴾ الجاثية/ ٢٣. واتە: ئایا نەتبینی ئەوکەسانەی کەنەفس و ئارەزوو حەزی خۆیان کردوە بەخوای خۆیان و دەیپەرستن و خوای گەورەش سەرباری ئەوە، ئەوەندەی تر گومرای کردوون

لەگەڵ شارەزایشیاندا بە حوکمی تاوانە. یان ئەبینی کاتێ خوای گەورە ئامۆژگاری( داود ) پێغەمبەر دەکات و دەفەرموێت: ﴿ **يا داود إنا جعلناك خليفة في الارض و لا تتبع الهوى فيضلك عن سبيل الله** ﴾ ص/٢٦. وا تە: ئەی داود ئێمە تۆمان کردوە بەجێ نیشین لەسەر زەویدا و شوێنی هەواو ئارەزو مەکەوە، چونکەئەگەر شوێنی کەوتی ئەوا لەرێگەی پەروەردگار لات دەدات و بەدورت ئەخاتەوە، دەبینی خوای گەورە ئامۆژگاری پێغەمبەرێکی پەروەردەکراوی دەستی خۆی ئاوەو شێوەی دەکات و بەبێ پەردەپۆی دەفەرموێت: نەکەی یەخسیر و بەندەی هەواو ئارەزوو بیت، ئەگینا بەدبەخت و سەرگەردان و ماڵ ویران ئەبیت و ئەوجا لەرێگەی راستی خواپەرستانیش بەدوور ئەکەویتەوە و گومڕا ئەبیت.

کەواتە موسڵمانیش کەشوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزانەیە پێویستە بزانێ ئەو فەرمانەی کە ڕووی کردۆتە پێغەمبەران(عليهم السلام) هەمان ( خطاب) و بەرپرسیارێتی‌یە کە ئاراستەی ئەم ئەبێتەوە و رووی تێدەکات، کەوا تە پێویستەلەسەر ئەمیش بەهەمان شێوە بەرگری نەفس و ئارەزوەکانی بکات و هەروا بەئاسانی خۆی تەسلیمیان نەکات و یەخسیری داوو تەڵەکەیان نەبیت، چونکە چۆن خوا پێغەمبەرەکانی ئاگادار کرد و پێی فەرموون لەرێگەی راستی خوا پەرستی لاتان نەدات هەمان لادان و لەرێ دەرچوونیشە کەیەکەنگیری دەستەو یەخەی ئەمیش ئەبێتەوە، ئەگەر خوا نەخواستە خۆی دایە دەستی هەواو هەوەسی.

لەبەر ئەوە ئەو راستی‌یەم روون کردەوە نەوەکو لەکاتی خوێندنەوەی ئەم بیروڕای زانا پایە بەرزانە هەستی و بەنەزانی خۆت گوڵبژێری بکەیت و بڵێی ئا ئەمەیان شتێکی چاکەو لەگەڵ سروشتی مندا ئەگونجێ و ئەم خاڵەی ئەو باسی ئەکات لەمندا هەیەو کەواتە تاوانبارنابم بائەمەیان هەڵبژێرم و پەیڕەوی لێ بکەم، نابراکەم نەکەی خۆت بەسەر هەڵەی وادا بەریت و رێگە بۆ هەواو هەوەسی خۆت خۆش بکەیت بتکاتە بەندەو کۆیلەی خۆی و لەپیناو خۆیدا بەکارت بهێنێ و لە رێگەی راستی خواناسان بەدوورت بخاتەوە، بەڵکو هەردەم هەوڵ بدە بەگوێرەی توانا رێگەی زانا( زاهید ) و دونیا نەویستەکان بگرە و خۆت بەدوور بگرە لەو تاوانانەی کەگومانی دوور لە خواییان لێ دەکرێت، کەلەپاشەڕۆژدا ئەبێتەمایەی دڵتەنگی و پەشیمان بوونەوە، وە دەبێتە مایەی زەرەر مەندی دونیاو قیامەت. جالەبەر ئەوە زۆر وریابە لەوەرگرتنی فەتوایەکی فیقهی‌داو بزانە سەرەنجامەکەی بەرەو کوێت دەبات. چونکە ئەگەر تۆ

بەنەزانی و بەکوێرانە فەتواکە وەربگرێت وپـەیڕەوی لێ بکـەیت، ئـەوا زانـای فـەتوا دەر بەرپرسیار نیە لەوەی کەتۆ بەناوی ئەوەوە بەهەڵەدا بچیت، چونکە ئەو لەنیەتێکی زۆر پاکە و خواپەرستانەوە ئەو فەتوایەی دەرکردووە، کەواتە پێویستە لەسـەر تـۆ بەوپـەڕی دڵپاکی و خواپەرستانەوە وەری بگریت و بـوار نەکەیتـەوە بـۆ نـەفس و ئارەزووەکانت بەنـەزانی خـۆت تەئویلی بۆ بکەیت و ناوەڕۆکەکەی بشێوێنی بەناوی( ئیصـــــلاح)و چاککردنـەوە، لەبـەر ئـەوە براکانم زۆر وریابن لەوەرگرتن و خوێندنەوەی فەتوایـەکدا کەلەسـەردەمێکدا ووتـراوە وئێسـتا سەردەمێکی ترە، چونکە هەندێ فەتوا هەیە گۆڕانی بەسـەردا دێـت بـەهۆی کـات و شـوێنەوە، بەڵام هەندێکی تریان هەروا بەجێگیری (ثابت) دەمێنێتەوە، چونکە زانایەکی لەوبـەرزتر نیـە بتوانێ بەڵگەی بەهێزتر لەوەی ئەو بهێنێتەوە و هەڵیوەشێنێتەوە و فەتوایەکی تر لەجێگـەیدا دابنێ، لەبەر ئەوە ئەو فەتوایە کەدراوە هەروا بەبێ بەڵگەوبەسـادەو ساکاری نـەدراوە بـەڵکو لەدوای هەڵسەنگاندنێکی تێر و پڕ ئینجا دەرکراوە، کەواتە وەرگرتنیشی هەروا شتێکی سادەو ساکارنیە، بـەڵکو پێویسـتە بەلێکۆڵینـەوەو وورد بینیـیـەکی زۆرەوە وەربگـیرێ وپاشـان پەیرەوی بکرێت، پاشان شتێکی گرنـگ تـر لـەوەرگرتنی فـەتوادا ئەوەیـە کەئـەو دەوروبـەر و ڕووداوەی تێی دەکەوێت تەواو و بەرامبەر بێت لەگەڵ ئەوکارەساتەی کەڕووبەڕووت ئەبێتەوە، واتە تەواو بکەوێتە ئەو ترسناکییەوە، ئەگـەر ئـەو فەتوایـە بـەفریات نەکـەوێت ئـەوا تووشـی تاوانی زۆر لەوە گەورەتر و خراپتر دەبیت، ئالەو کاتەدا بە(تراضـــــع) و ملکەچییـەوە پشـت بەوفەتوایە ببەستە و لەهەمان کاتیشدا داوای لێبووردن و لێخۆشبوونت لـەخوای گـەورە لـەبیر نەچێت، (إنشاء الله) ئەوکاتە خوای گەورە بەتاوان لەسـەرت نانوسـێ و قەڵـەمی لێ بـووردەی بەسەر تاوانەکەتدا ئەهێنێ، ئەمەلەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە نابێت زیـادەڕەوی لەوفەتوایـەدا ·کەیت و لەدەست حاڵەتە ناچارییەکە ڕزگارت بوو، دیسانەوە بچیتەوە سـەر ئـەوکارەخراپ و ترسناکە و چەندان جاریتر بەناوی ئەوفەتوایەوە دووبارەو سێ بارەی بکەیتەوە، چونکە ئێمـە بۆ هەریەکێ لەوشتانە کەبەسەر مرۆڤدا دێت(قاعیدەی شەرعی) مان هەیـە و بۆمـان نیـە لێی لابدەین، وەکو لەم بەشەی دواییدا بـەرچاوت ئەکـەوێت، پاشـان نـابێت ئەوکەسـە بەسـەر ئـەو ڕێگایانەدا بڕوات کەبەرەو ڕودانـی ئـەو ڕووداوە دەبیـات و دەیکاتـە ناوبازنـەی ترسـناکی ئـەو تاوان و خراپەکارییەوە، خۆ ئەگەر خۆی بەدوای خاڵی نزیک بونەوەی توشبوونی ئەوتاوانـەدا

گەرا، ئەوا فەتواکە نایگریتەوە، بەڵکو دەبێت لەحاڵەتێکی چاوەڕوان نەکراودا بەدەم جێبەجێ کردنی ئەوفەتوایەوە بچێت ئەویش لەسەر قاعیدەی( إرتكاب أخف الضررين ) واتە: کردنی تاوانێکی بچوک بۆ رزگاربوون و توش نەبوون بەتاوان و گوناهێکی گەورەتر، کەواتە ئەگەر بەکردنیگوناهێکی بچوک رزگارت بێت لەدەست تاوانێکی گەورە تر، ئەوە تاوانە بچوکەکە ئەکەیتە قۆچی قوربانی تاوانە گەورەکە، جائەمە بەرکوڵێکی زۆر کەم بوو لەبارەی فەتواو چۆنێتی وەرگرتنی و پەیڕەوی یکردنی لەکاتی خۆیدا و زیادەڕەوی نەکردن تیایدا.

***ئێستاش دێینە سەر وەرگرتنی رای هەندێ لەزانا و فوقەها بەرزەکانی ئیسلام لەم بارەیەوە:***

١) لەکتێبی ( الدر المختار، شرح تنوير الأبصار ) دا کەلەسەر رێڕەوی ئیمامی حەنەفییە(رەزای خوای لێ بێ ) هاتوە و دەڵێت: (ولكن الإستمناء بالكف، وإن كره تحرحالحديث(ناكح اليد ملعون) ولو خاف الزنا يرحى أن لاوبال عليه) [٢٨]، واتە: ئەگەرچی کردنی (ئیستیمناء ) شتێکی رێگە پێ نەدراوە و کردنی چاک نییە، لەبەر ئەو فەرمایشتەی کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی (ئەوانەی ئیستیمناء ئەکەن مەلعونن)، بەڵام ئەگەر هات و لەزیناکردن ترساو کەوتە ناو کارەساتێکی ئاوا گەورەوە، ئەگەر لەکاتێکی ناسکی وادابوو، تەواو ترسی بۆ هاتبوو، ئەو کاتە ئەگەر( ئیستیمناء ) ی کرد بۆئەوەی لەدەست ئەوتاوانە گەورەیە کە زینایە رزگاری بێت ئەوە تکا وایە کەخوای گەورە بەتاوان لەسەری نەنوسێت.

٢) لەکتێبی (رد المختار عل الدر المختار)دا: هاتووە و دەڵێت: (لو تعين الخلاص من الزنا أي بالإستمناء باليد وحب لأنه أخف) [٢٩]، واتە: ئەگەر کەسێک زانی بێگومان تووشی زینا دەبێت ئەگەر ئیستیمناء نەکات رزگاری نابێت لەو تاوانە گەورەیە، ئەوە لەوکاتەدا ( پێویست ) ئەبێت لەسەری کە( ئیستیمناء ) بکات، لەبەرئەوە ( ئیستیمناء ) لەو کاتەدا تاوانی کەمترە لەزیناکردن، جائەگەر زانی بەو ( ئیستیمناء )یە رزگاری ئەبێت لەدەست زیناکردنەکە ئەوەبابەو رێگەیە خۆی رزگار بکات.

---

(٢٨) الدر المختار على شرح تنوير الابصار م/٢ص٣٩٩.

(٢٩) رد المختار على الدر المختار/المجلد٢/ص٣٩٩ لأبن زين العابدين.

٣) لەکتێبی(السراج) لشرف الدين النووي دا: هاتووە و دەڵێت: (إن أراد بذلك تسكين الشهوة المفرطة الشاغلة للقلب وكان عزبا لازوجة له و لا أمة أوكان،إلا أنه لايقدر و على الوصول إليها لعذر، قال أبو الليث أرجو أن لا وبال عليه، وأما فعله لأستجلاب الشهوة فهو إثم)[٣٠] واتە: ئەگەر هات و ئەو (ئیستیمناء)یەی بۆ ئەوە بوو کە گڕو بڵێسەی ئارەزوویی کەم ببێتەوە، کەزیاد لە(سنووری) خۆی لە لەشیدا ئەو مەنی‌یە مابوەوەو دەبوە هۆی‌سەرقاڵ (مەشغول) کردنی‌دڵ و مێشکی و لەهەمان کاتیشدا نەخێزانی هەبوو، وەنەکەنیزەک، وەنەشی ئەتوانی خێزان پێکەوە بنێ لەکاتی ئاوادا (أبو الليث) دەڵێ ئومێد و هیوا وایە کەخوا گەورە بەتاوانی‌نەنوسێت لەسەری، بەلام لەهەمان کاتیشدا دەفەرموێت: (وأما فعله لأستجلاب الشهوة فهو إثم)[٣١] واتە: بەڵام ئەگەر هات و ئەم (ئیستیمناء)ەی تەنهابۆ رابواردن و خۆشی هەواو هەوەسی بوو، وەبەبێ هیچ هۆیەک پەنای بەرێتە بەرو (مەنی) خۆی بهێنێتەوە، ئەوە بەتاوان و گوناه ئەنوسرێت لەسەری، لەبەر ئەوەی (عوزر)ێکی شەرعی بەدەستەوەنی‌یە کاتێک کە هەستاوە بەکردنی ئەم کردارە ناسروشتی‌یە.

٤) لەکتێبی (تكملة المجموع)دا کەلەسەر ڕێڕەوی ئیمامی شافیعی‌یە (ڕەزای خوای لێ بێ) هاتووە و دەڵێت: (ويحرم الإستمناء باليد، لقوله تعالى ﴿ **والذين هم لفروجهم حافظون**... إلى... **فمن إبتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون** ﴾ فإن فعل عزر و لم يحد)[٣٢]، واتە: کردنی (ئیستیمناء) شتێکی‌حەرامە و ئەنجام دانی دروست نیە، لەبەرئەوەی خوای گەورە لەوئایەتانەی سورەتی(المعارج) و(المؤمنون) دا ئاماژەی بۆ کردووە، وە ئەگەرهات و یەکێکیش ئەم کردارەی‌بەنەزانی و بەهەڵە کرد ئەوا (تعزیر)[أ] ئەکرێت، بەلام(حەددی)[ب] لێ نادرێت.

٥) لەکتێبی(فتح القدير) ی (ابن همام) کەلەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەیە هاتووەو دەڵێت:(ولايحل الاستمناء بالكف، فإن غلبت الشهوة ففعل إرادة تسكينها فالرجاء أن لايعاقب)[٣٣]، وا تە کردنی (ئیستیمناء) حەلاڵ و دروست نیە بکرێت، بەلام ئەگەر کەسێک شەهوەتەکەی زۆری بۆ هێنا و نەیتوانی خۆی زاڵ بێت بەسەریدا، وەئەویش ئەم کردارەی کرد بۆ ئەوەی تین و کڵپەی داپمرکێنێتەوەو ئەوەندەی تر بیر و مێشک و دڵی سەرقاڵ نەکات، ئەگەر بۆ ئەو مەبەستەکردی ئەوا تکاو هیوا وایە کەلەسەری سزا نەدرێت.

---

(٣٠) السراج على متن المنهاج لشرف الدين النووي / محمد زهري الغمراوي.

(٣١) السراج على متن المنهاج لشرف الدين النووي / محمد زهري الغمراوي.

(٣٢) تكملة المجموع شرح المهذب للشيرازي/المجلد/١٨/ص٢٦٧ لأبن همام الحنفي(رحمه الله).

(أ) تعزير: واتە: ئەو سزایەیە کە کاربەدەستی موسڵمانان دیاری دەکات بۆ ئەو تاوان بارانەی کە شەرع سزای دونیای دیاری نەکردووە بۆ تاوانەکانیان.

(ب) الحد: واتە: (المنع): ئەو سزایەیە کە (شارع) واتە بەرنامە دانەر دیاری کردووە بۆ چەند تاوانێک کە هیچ کەس ناتوانێ لێ لابدات و کەم و زیادی بکات جگە لە ڕاگرتنی حوکمێک لەلایەن (خەلیفە) کاربەدەستەوە.

(٣٣) فتح القدير لشرح الهداية/ المجلد/٢/ص٦٤/لأبن همام الحنفي.



٦) لەکتێبی(سبل السلام)دا کەشەرحی(بلوغ المرام)ە هاتووە و دەڵێت: (وبعض المالكية على تحريم (الإستمناء) لأنه لوكان مباحا لأرشد إليه لأنه أسهل) [٣٤]، واتە: وەهەندێ لە مالکیەکان کەلەسەر ڕێڕەوی ئیمامی مالیکن بە حەرام و قەدەغەیان داناوە کردنی(ئیستیمناء)، چونکە ئەگەر حەلاڵ بوایە ئەوا ئەوانیش ڕێگەیان بەئیمە نیشان ئەدا بۆ کردنی لەبەر ئەوەی کردنی ئەم کردارە شتێکی زۆر ئاسانە.

٧) لەکتێبی (المحلى-لأبن حزم الأندلسي الظاهري) دا هاتووە و دەڵێت: (وكذلك الاستمناء للرجل سواء بسواء لأن مس الرجل ذكره بشماله مباح، ومس المرأة فرجها كذلك مباح بإجماع الامة كلها ألا إنه نكرهه لإنه ليس من مكارم الاخلاق ولا من الفضائل) [٣٥]، واتە: بەراستی ئیمە ئەم کارە بەچاك نازانین و کەنارگیری لێ دەکەین لەبەر ئەوەی کە(ئیستیمناء) لەخورەوشتە بەرزەکان نیە و لەشتە زۆر چاك و جوانەکانیش نیە، لەبەر ئەوە کردنی شتێکی (مەکروهە).

(ثم قال إبن حزم الاندلسي:والكراهة صحيحة عن عطاء) [٣٦]، واتە(إبن حزم) دەڵێ: وەبەڕاستی پێناخۆش بوون و کەنارگیری لە ئیستمناء شتێکی راستە لەلایەن(عطاء)ەوە پێمان گەیشتووە، لەوانەیە ئەو (عطاء)ە(عطاء بن رباح) بێت کەزانایەکی زۆر بەرزو تێگەیشتوو بووە.

٨) لەکتێبی(فقه السنة) دا هاتوە و دەڵێت: (وروى لنا أن الناس تكلموا في الإستمناء فكرهته طائفة وأباحته أخرى وممن كره إبن عمر، وعطاء) [٣٧]، واتە: پێمان گەیشتووە کەخەڵکانێکی زۆر دەربارەی (ئیستیمناء) قسەیان کردوە و هەمووشیان رای جۆر بەجۆرو جیاوازیان هەبووە، کەهەندێکیان زۆر دژی وەستاون و پێیان چاك نەبووە، و هەندێکیتری بۆ کاتی زۆر پێویست کە(کەوتنە ناو زینا)یە ڕێگەیان پێداوە.ئەوانەی پێیان چاك نەبووە، وەکو: عبدالله ی کوڕی عومەر و عطاء.

---

(٣٤) سبل السلام لشرح بلوغ المرام/المجلد/٣/ص١٤٥ محمد بن إسماعيل الصنعاني.

(٣٥) المحلى لأبن حزم/م/١١/ص٣٩٢-٣٩٣ لأبن الحزم الظاهري.

(٣٦) المحلى لأبن حزم/م/١١/ص٣٩٣ لابن الحزم الظاهري.

(٣٧) فقه السنة/م/٢/ص٣٦٧ لسيد سابق.



(وأما الذين ذهبوا إلى التحريم في بعض الحالات، و الوجوب في بعضها الاخر، فهم الاحناف فقد قالوا: إنه يجب الإستمناء إذا خيف الوقوع في الزنى بدونه، جريا على قاعدة (إرتكاب أخف الضررين) [٣٨]. واته: وەهەندێك لەو زانایانە بەحەرامیان داناوە لەهەندێ کاتدا، وە کردنی لەهەندێ کاتی تری زۆر پێویستدا، لەوانە( حەنەفی )مەزهەبەکان کەئەڵێن: ئەگەر ئەوکەسە ترسا لەوەی کەبکەوێتە ناو زینایەکی حەتمیەوە، ئەوە لەکاتیوادا پێویستە کە( مەنی )یەکەی خۆی بهێنێتەوە بۆ ئەوەی لەدەست زیناکە رزگاری ببێ، چونکە حاڵەتی وابەر ئەو ( قاعیدە شەرعی ) یە ئەکەوێت کەئەفەرموێت( إرتکاب أخف الضررین ) واتە کردنی شتێك کەزەرەرو زیانەکانی لەوی تر کەمتر بێ، وەتاوانەکەشی لەو تاوانەی تر کەمتر بێت، ئاشکراشە کە( ئیستمناء ) تاوانی لە( زینا ) کەمترە.

لەهەمان کاتیشدا( حەنبەلی )یەکان، واتە ئەوانەی کەلەسەر ڕێڕەوی أحمد ی کوڕی حەنبەلن- رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێن:( إنه حرام، إلا إذا أستمنى خوفا على نفسه من الزنى، أو خوفا على صحته، و لم تكن له زوجة أو أمة، و لم يقدر على الزواج فإنه لاحرج عليه) [٣٩]. واتە: کردنی ( ئیستیمناء ) حەرامە، تەنهالەکاتێکدا نەبێت کەترسا لەنەفسی خۆی توشی زینا ببێ، یان ترسا لە تەندروستیی، وەلەهەمان کاتیشدا نەخێزانی شەرعی وە نەکەنیزەکی هەبوو، وەنەشی ئەتوانی کەژن بهێنێ، لەکاتێکی ئاواترسناکدا ئومێدوایە کەخوای گەورە بەتاوان و گوناهی نەنوسێت، چونکە حاڵەتی زەروریە.

٩) لەکتێبی ( فتاوى)ی شیخ الەسلام ( إبن تيمية )دا هاتوەو و دەڵێت: ( وإما إنزاله-أي المني- بإختياره فهو حرام عند أكثر العلماء وهو إحدى الروايتين عن أحمد، بل أظهرهما، وفي رواية إنه مكروه، لكن أضطر إليه مثل أن يخاف الزنا إن لم يستمن أو يخاف المرض فهذا قولان مشهوران للعلماء، وقد رخص في هذه الحال طوائف السلف و الخلف ولهى عنه آخرون) [٤٠]. واتە: هێنانەوەی( مەنی ) مرۆڤ بەدەستی خۆی بەبێ ڕوودانی هیچ هۆیەکی گرنگ ئەوە حەرامە و گوناهە لەلای زۆر بەی زانایان کە یەکێکیان ریوایەتەکەی ئیمام ( ئەحمەدی کوڕی حەنبەل )ە، وەهەندێکی تریان ئەڵێن، ئەگەرهات و کەوتە ناچارییەوە و ترسا لەوەی کەتوشی زینا ببێ، یان ترسا لەوەی کەنەخۆشی بەدواوە بێت ئەوە دوو( قەولی ) زۆر بە ناو بانگی زاناکان هەیە، وەهەندێ لە( پێشینەکان ) و ( دواینەکان ) بۆکاتێکی وا رێگەیان داوە بەکردنی، بەلام لەهەمان کاتیشدا هەندێکیتر یان لەوکاتە ناچاری یەشدا رێگەیان پێ نەداوە و ( نەهی )یان کردووە لە کردنی. دەبینی لێرەدا فەتوایەکی تازەمان بەرچاو ئەکەوێ، کەئەویش ئەوەیە هەندێ لە( پێشینەکان ) و ( دواینەکان ) بۆئەو کاتە ناچارییەش هەرڕێگەیان پێ نەداوە و فەتوای کردنیان نەداوە.

---

(٣٨) فقه السنة/م/٢/ ص٣٦٨ لسيد سابق/١٤٠٣هـ الطبعة العراقي.

(٣٩) فقه السنة/م/٢/ص٣٦٨/ لسيد سابق. الحلال و الحرام في الاسلام/ للدكتور يوسف القرضاوي.

(٤٠) مجموع فتاوى/ شيخ الإسلام إبن تيمية/ المجلد/١/ ص٦٢. إختلاف الفقهاء/ تأليف/ أبي جعفر محمد بن جرير الطبري/ص

١٠) لەکتێبی(فتاوی وبحوث شرعیة)ی، زانای بەڕێز(شێخ حسنین محمد مخلوف) کە (مفتی) و فەتوا دەری میسر بووە، هاتووەو دەڵێت: (ومن هذا يظهر أن جمهور الائمة يــرون تحريم الاستمناء باليد و يؤيدهم في ذلك مافيه من ضرر بالغ بالاعصاب و القوى و العقول و ذلــك يوجب التحريم، و المروي عن أحمد وعن الحنفية جوازه عند الحاجة و الضرورة القصوى) [٤١]. واتە: وەکو بۆمان ڕوون و ئاشکرابووە، ئەوەیە کەدەبینین زۆربەی زۆری پێشەوا گەورەکانمان کردنی (ئیستیمناء)یان بەحەرام داناوە، وەئێمەش لەم حەرام کردنەدا پشتگیریان لێ دەکەین، لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ بەشێوەی زانیاری تازە دەرکەوتووە کەکردنی(ئیستیمناء) زەرەر و زیانێکی زۆر زۆری بەدواوەیە و زیانی هەیە بۆ بیرو هۆش و کەم کردنەوەی هێزو توانای ژیری و چەندەهازەرەرو زیانیتر[٤٢]، لەبەر ئەوە ئەم زەرەر وزیانانە ئەبنە هۆی ئەوەی کەکردنی ئەم کردارە حەرام بکات و بە تاوان و گوناه بنوسرێت، بەڵام هەندێک لەئیمامە بەڕێزەکان وە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیمامی ئەبوحەنیفە(ڕەحمەتی خوای لێبێ)، لەکاتە زۆر زەرورو ناچاریانەدا(الضرورة القصوى)دا کەکەوتنە ناو زینایە ڕێگەیان پێداوە، بۆئەوەی تاوانەکەی لەزیناکەکەمتر بێت. بەڵێ کردنی ئەم کردارە زەرەر و زیانێکی زۆری هەیە بۆ سەرلاشەی مرۆڤ، وەلەهەمان کاتیشدا تەنها جارێک(مەنی)هێنانەوەی مرۆڤ بەدەستی خۆی بەشی (٤ تا ٥) جاری (جیماعی شەرعی - جووت بونی شەرعی) ئەکات، واتە بەکرداری(ئیستیمناء) هەر لەیەک جاردا ئەو ڕێژە زۆرە لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێتە دەرەوە و چەندەها جار زەرەر و زیان بەخۆی ئەگەیەنێت[*].

١١) لەتەفسیری(حاشیة)ی(صاوي) لەشەرحی (تفسیر الجلالین)دا هاتووەو دەفەرموێت: (فهو حرام عند مالك و شافعي وأبي حنيفة، و قال: أحمد بن حنبل يجوز بشرط ثلاثة: أن يخاف الزنا و ألايجد مهر حرة أو ثمن أمة وأن يفعله بيده لابيد أجنبي أو أجنبية) [٤٣].

---

(٤١) كتاب فتاوى و بحوث شرعية/ المجلد/١/ص١٨٣/للشيخ حسنين محمد مخلوف.

(٤٢) زەرەرو زیانەکانی بەشێوەی زانیاری تازەو بەدرێژی ئەکەوێتە بەشی پێنجەمی ئەم باسەوە.

(*) تەنانەت مرۆڤ لەگەڵ خێزانی شەرعی خۆشیدا چاکە وایە کەبەکەمی بەیەک بگەن و کەمتر(جیماعی شەرعی) لەگەڵ یەکتردا بەئەنجام بگەیەنن، وەکو ئەوەی کەشەرع دایناوە چاکتروایە لەهەرهەفتەیەکدا(دووجار-یان سێجار) بەیەک بگەن، بۆ ئەوەی زەرەرو زیانیان کەمتر پێ دەگات، بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە:

١- زواجك أيها المسلم/ص٦٣/عبد العليم السعدي.

٢- المرأة في الفكر الاسلامي م/١/ص١٤٨,٣.

٣- تربية الاولاد في الاسلام/م/١/ص٥٧٠-٥٨٠.

٤- المرأة بين الفقه والقانون/لدكتور مصطفى السباعي.

٥- روح الدين الاسلامي/ص٣٧٣-٣٧٤/ تأليف عفيف الطبارة.

(٤٣) حاشية صاوى لمجلد/٣/ص١١٢/الشيخ العلامة صاوي/السنة ١٩٣٩م - ١٣٥٧هـ.

واتە: کردنی ئیستیمناء حەرامە لەلایەن ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی و ئەبو حەنیفەوە، وە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەفەرمویت: ئیستمناء دروستە لە سێ کاتدا، ئەگەر کاتێك ترسا لەوەی کە توشی زینا بێ ، وە یان توانای مارەیی ئافرەتی نەبێت کە بیهێنێت، وە توانای کەنیزەکێکیشی نەبێت، وە ئەگەر هات و ترسا توشی زینا بێت دەبێت بەدەستی خۆی بیکات نەك بەدەستی یەکێکی تر.

١٢) وە هەروەها لە کتێبی(تربية الأولاد في الإسلام )دا هاتووە،و دەڵێت:

لهذا قال الفقهاء (إن الإستمناء باليد حرام إذا كان لجلب الشهوة و إثارتها و هي هادئة، أما إذا غلبت الشهوة بحيث شغلت البال، و أقلقت الخاطر، وأوقفت على باب الفاحشة، و تعين الإستمناء طريقا لتسكينها فإن الأمر جائز و مكافئ بعضه بعضاً، و ينحو صاحبه رأساً برأس أي لا أجر عليه و لا وزر فلا يثاب) هذا النص الفقهي من كتاب(ردود على أباطيل) للعلامة المرحوم الشيخ محمد الحامد ص٤٢. تربية الأولاد في الإسلام/ عبد الله ناصح علوان/ الجزء الثاني/ الصفحة٥٨٦.

واتە: هەندێ لە زانایانی شەرع زان دەفەرموون( ئیستمناء کردن حەرامە ئەگەر بە مەبەستی دامرکاندنەوەی ئارەزووی خۆ بێت یان وورووژاندنی ئارەزوو بێت. بەڵام ئەگەر تەوژمی ئارەزووی زۆری بۆ هێنا بە جۆرێك کە مێشکی مەشغوڵ بکات، وە توشی لەرزۆکی بیرکردنەوە بێت، وە ڕاوەستا بێت لەبەر دەم دەرگای تاواندا، لەم حاڵەتەدا ئیستمناء ڕێگەیەك بێت بۆ دامرکاندنەوەیئارەزووی ئەوە دروستە. وە قەرەبوی هەندێك تاوانی گەورە بکاتەوە بە تاوانێکی بچووك.وە ئەو کەسە ڕزگاری دەبێت و سەربەسەر دەردەچێت نە پاداشتی بۆ هەیە و نە سزای لەسەرە ). ئەم دەقە وەرگیراوە لە کتێبی( بەرپەرچ دانەوەی بۆچونە پوچەکان ) زانای پایە بەرز شێخ ( محمد حامد )ە لاپەرە ٤٢.

# پوختەی ڕای زاناکان و فوقەهاکان
## ( خلاصة من أقوال العلماء والفقهاء )

ئیستا بە کورتی لە ڕای زانایانی توێژەرەوانی قورئـان و زانایـانی شـەرع زان (الفقـــهاء) دەگەینە ئەم ئەنجامە:

لە ڕاستیدا کردنی ئیستیمناء حەرامە و خۆ لێ پاراستن وە دوور کەوتنەوە لیێ کارێکی زۆر چاکەو دوور بوونە لە گوناهو تاوان، وە بە هەموو شێوەیەک جێگای کـنار گیری و دوورە پەرێزی بێ لیێ و لە کاتی زۆر پێویستیدا نەبێت پەنای نەبرێتە بەر کە ئەویش (هي الخـــوف المعتبرمن الوقوع في الزنى) ترسانێکی زۆرە لەکەوتنـە نـاو زیناکردنـەوە، ئەگـەر حاڵـەتێکی ئـاوا خراپ و ترسناکە هاتە ڕێگا، ئەوا (قاعیدەیەکی) شەرعیمان هەیە ئەفەرموێت

( الضرورات تبيح المحظورات) واتە ناچاری زۆر مۆڵەتی کردنی قەدەغە کراو دەدات. ( وما يبـاح إلا للضرورة ) وە کردنی ئەو شتەش حەلاڵ نییە بکرێـت تەنـها لـە کـاتی زۆر ناچاریدا نـەبێ (يباح بقدر ما تندفع به حالة الضرورة) وە تەنها ئەوەندەشی ڕێگا پێنەدرێ بەئەندازەی ئەوەی کە حاڵەتە (ضروري)یەکەی پێ لابچێ نەک زیاتر، چونکە قاعیدەیەکی تری شـەرعیمان هەیـە دەفەرموێت (الضرورات تقدر بقدرهـــا) ناچـاریش دەبـێ بـە گوێرەی پێویستی ئـەندازە گیر نەکرێت و، دەبێتە هۆی لاچوونی ( ضروري )یەکە، کەواتە نابێت زیادە ڕەوی بکرێت لە کردنـی ئیستیمنائدا [٤٤].

*کەواتە لەسەرجەم ڕای ئەو پێشەوا و فوقەها بەڕێزانەوە دەرئەکەوێت کە:*

١ ) کردنی ئیستیمناء شتێکی حەرام و قەدەغەکراوە.

٢ ) لە کاتی زۆر پێویست و زەروری دا نەبێت دروست نییە، ئەویش تەنها لـە کاتێکدایـە کە ترسی زینا هەبێت.

٣ ) یان لە کاتێکدا کەلە ڕێگەی پزیشکی باوەڕ پێکـراوە وە دەر بکـەوێت کەئـەو کەسـە ڕێژەیـەکی ( مـەنی ) زۆر لەلەشـیدا هەیـەو زەرەرو زیـان بەلەشـی دەگەیـەنێت و پێویسـتە ڕێژەکەی کەم بکرێتەوە، کەلە فیقهدا بەکەڵە شـاخ گرتـن نـاوی هـاتووە، ئـەوە بـۆ کـاتێکی وا قەدەغە نییە، ئەویش دەفەرموون ئومێد وایە کە گوناه نەبێت و بەتاوان نەنوسرێت.

٤ ) زۆر زۆر جێگـەی ( حـەزەر ) و خـۆ لێ دوور خسـتنەوەیە، لەبەرئـەوەی شـوێنەوارو زیانێکی زۆر خراپ لـە دوای خـۆی بـەجێ دەهێڵێ، کەلـە پاشـەڕۆژدا شـوێنەوارەکانی بـەدەر دەکەون ( وەکو لەبەشە زانیارییەکەیدایە ئەم ڕاستیانەت بۆ ڕوون دەبێتەوە ).

کەواتە مرۆڤی موسڵمان و لە خوا ترس بۆ ترسان لە حاڵەتێکی ترسـناکی وەکـو( زینـا ) نەبێت با پەنای نەباتە بەر.

---

(٤٤) التربية الإسلامية ، ٣ ص١٥٧- ١٤٠٧ هـ ١٩٨٦م.

# بەشی چوارەم
## ئیستیمناء لەڕوانگەی کتێبە جینسیەکانەوە

ئێستاش چاوێکی خێرا دەخشێنین بەو کتێبە جینسیانەی کەدوژمنانی ئیسلامیش دایان ناوە، بزانین ئەوان (ئیستیمناء) چۆن هەڵ ئەسەنگێنن و بەچ شێوەیەک باس لەزەرەرو زیانەکانی ئەکەن بەشێوەیەکی زانستیانەی سەردەم، فەرموون:

***پێناسەکردنی ئیستیمناء(تعریف الإستمناء):***

١) الإستمناء أو العادة السرية (الجنسية الذاتية) ممارسة الشخص للجنس مع نفسه[٤٥]:

واتە: پەیرەوی کردن و بەردەوام کردنیکردارێکی ئارەزووی جینسیە لەگەڵ نەفسی خۆیدا.

٢) الإستمناء: الحصول على الرعشة الجنسية بدون الوصال الزوجي[٤٦]، واتە: بریتیە لە(مەنی) هێنانەوەی مرۆڤ بەدەستی خۆی بەبێ گەیشتن بەخێزانی شەرعی خۆی.

٣) وفي الإستمناء لاتسعى الغريزة الجنسية لأشباع رغباتها عند شخص آخر بل تشبع نفسها عند الشخص ذاته) [٤٧] واتە: لەکرداری ئیستیمناء دا ئەوکەسە ئارەزواتیجنسی خۆی تێر ناکات لەڕێگەی یەکێکی ترەوە، بەڵکو ئارەزواتی دەروونی خۆی تێر ئەکات تەنها لەڕێگەی ئیستیمنائەوە، کەواتە ئەمە پێناسەی ئیستیمنائە کە پێناسەکەی روون و ئاشکرایە، کەبریتیە لە(مەنی) هێنانەوەی مرۆڤ بەدەستی خۆی، کەئەو کردارە دەست پیاهێنانە دەبێتە هۆی دەرچوونی ڕێژە(مەنی)یەکی زۆر کەبە زۆرەملێ دەری دەهێنێتە دەرەوە.

---

(٤٥) الإنحرافات الجنسية عند الرجل والمرأة ، ص٦٣ جمال مصطفى مردان - ٩٨٤ المأخوذ من المصدر: الإضطرابات الجنسية - دراسات سيكولوجية وجنسية - ترجمة د. صلاح عدس - المكتب المصري للطباعة.

(٤٦) الإنحرافات الجنسية - ص٦٣ - جمال مصطفى مردان - السنة ٩٨٤ مكتبة النهضة و: حياتنا الجنسية / مشكلاتها وحلولها - فريدريك كهن - المكتب التجاري - بيروت ١٩٥٦..

(٤٧) حياة العزاب والمراهقين - الجنسية والتناسلية - ص٤٤ مشكلات و حلولها و: الإنحرافات الجنسية - ص٦٣ والمصدر: الحب والزواج / د. أمين رويحة - منشورات مكتبة النهضة بغداد ١٩٨٣..

إن العادة السرية يمارسها الشباب و الشابات وتكون أكثر إنتشاراً في المجتمعات المغلقة أو المجتمعات المكبوتة التي تضع قيودا وفاصلا بين الرجل والمرأة ولذلك يلجأ الشباب الى ممارسة العادة السرية كبديل عن العملية الجنسية الطبيعية وهي ترتبط دائما بإثارة الأعضاء الجنسية مع تخيلات حول ممارسة الجنس مع الجنس الآخر (٤٨).

واته: ئەنجام دانی ئەم کردارە لەلایەن کورو کچانی گەنجەوە پەنای دەبرێتە بەر، وەزیاتر لەو شوێنانەدا بڵاوە کەلەناو کۆمەڵگایەکی داخراودا بێت، یان لەناو کۆمەڵگایەکی وادا بێت کەیاساو دەستورێکی تایبەتیان هەبێت و چەند سنورێکیان داناوە لەنێوان ژن و پیاودا کەوا گەنج نەتوانێ بەئارەزوی خۆی دەست بەرێ بۆ هەرئافرەتێک کەخۆی دەیەوێت لە بەر خوونەرێتی ئەو شوێنەی کەتێیدا دەژین، لەبەر ئەوە گەنج هیچ چارێکی نامێنێ ئەوەنەبێت کەپەنا بەرێتە بەر( ئیستیمناء ).

إن الاثارة هنا تتم عن طريق مشاهدة الصور العارية أو إمرأة أو الكتب الجنسية أو رؤية إمرأة أو سماع كلمات جنسية كل ذلك يؤدي إلى إثارة الأعضاء التناسلية وبالتالي مطاوعة الشخص لذاته في ممارسة العادة السرية (٤٩).

واتە: ئەو هۆیانەی کەدەبنە هۆی روودانی ئەم کردارە، جاری وا ئەبێت لەرێگەی وێنەیەکی رووتی ناشەرعیەوە دەبێت، یان بەهۆی خوێندنەوەی رووداوێکی جینسیەوەیە، یان بینینی ئافرەتێک یان گوێی لەچەند وشەیەکی جینسی ئەبێت، هەموونەمانە ئەبنە هۆی گڕگرتنی ئارەزواتی جینسی و بەناچاری پەنادەباتە بەر ئیستیمناء.

إن نسبة ٩٠% من الرجال قد مارسوا العادة السرية في فترة من حياتهم وهذه النسبة تزيد و تقل حسب الظروف الاجتماعية المحيطة بالانسان و لكن من المؤكد أن نسبتها عالية بين المراهقين (٥٠).

---

(٤٨) الإنحرافات الجنسية عند الرجل والمرأة – ص٦٤..

(٤٩) الإنحرافات الجنسية عند الرجل و المرأة/ص٦٤– التربية الجنسية/سول بيسي/دار المعارف بمصر/١٩٦٨.

(٥٠) الانحرافات الجنسية/ص٦٥– التربية الجنسية/سول بيسي/١٩٦٨.



واتە: پیاوان بە ڕێژەی لەسەدا(٩٠) پەنا دەبەنە بەر ئەم کردارە لەماوەی ژیانیاندا، وەئەم ڕێژەیەش کەم و زیاد دەکات بەگوێرەی ئەو خوو و نەریتە کۆمەڵایەتیەی کەدەوری مرۆڤی داوە، بەڵام بە(تأكيد)ی ڕێژەی ئەم کردارە زۆر بەرزە لەلای کوڕو کچانی گەنجەوە کەتازە پێ دەگەن، هەروەکو لەیەکێ لەقوتابخانەکانی ئینگلترا دا بەڕێوەبەرەکەی هەستا بە لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی قوتابیەکانی بۆ زانینی ڕێژەی ئەنجام دانی کاری(ئیستیمناء)، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بۆی دەرکەوت کە لەنێوان(١٥٠) کوڕدا کەتەمەنی ناوەندی یەکان(٥ر١٠)دەساڵ و نیو بوو، بەم ڕێژەیە بوو:

١- لە٣٤% بەردەوام ئەم کردارە دەکەن.

٢- لە١٤% هەندێک جار دەیکەن و هەندێ جاریش وازی لێ دێنن بەهۆی ئامۆژگاری دایک وباوکیانەوە.

٣- لە١٠% هەموو شەوێک ئەم کردارە دەکەن.

٤- لە ٢٧% هەموو هەفتەی جارێک دەیکەن.

٥- لە ١٥% لەدووهەفتە جارێک دەیکەن. [٥١]

(أما بالنسبة لمزاولة العادة السرية في سن المبكر نجد أن الفتيات هن أكثر ممن مارسن العادة السرية)[٥٢] واتە: لەتەمەنی تازە پێگەیشتووی کچاندا زیاتر ئەم کرداری ئیستیمنایە ڕوودەدات، وەکو لەم سەر ژمێریەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کەکۆمەڵێک لە پسپۆڕانی ئەم بوارە پێی هەڵساون، کەدەردەکەوێت ڕێژەی ئەنجام دانی ئەم کارە لە کوڕان و کچاندا بە پێی تەمەنیان:

| کردنی ئەم کارە لە تەمەنی | ڕێژەی کوڕان | ڕێژەی کچان |
|---|---|---|
| هەتا تەمەنی (١٢) ساڵی | ٢٠ر٩ % | ٤٩ر١ % |
| لە(١٢) وەتا(١٥) ساڵی | ٤٤ر٢ % | ١٤ر٦ % |
| لە(١٥) تا (١٨) ساڵی | ٣٠ر٢ % | ٦ر٢ % |
| دوای (١٨) ساڵی | ٤ر٥ % | ٣٠ر١ % |

(٥١) الانحرافات الجنسية /٦٥- التربية الجنسية/سرل بيسي/١٩٦٨.

(٥٢) الانحرافات الجنسية/ص٦٧- حياتنا الجنسية/فريدريك كهن.

(إن المعالجة اليدوية و المداعبة للأعضاء التناسلية هي الوسيلة الشائعة لممارسة العادة السرية أما في الاناث فإنهن يحصلن على اللذة و ذلك عن طريق حركات القحدين أو بحك المناظر التناسلية باليد أو بوضع وسادة بين الفخذين) [٥٣] .

واته: چارەسەر كردنی جینسی و دامركاندنەوەی بەڕێگەی ئیستیمناء لەلایەن پیاوانەوە شتێكی ئاشكراو بەربلاوە، بەڵام لەئافرەتاندا بەهۆی ڕانیانەوە یان بەهۆی دانانی شتێك لەنێوانی هەردوو ڕانیاندا، وەیان بەكرداری لێك خشاندن ئەم كردارە ڕوودەدات.

وتشير المعالجات السرية للفتيات المصابات بالهستريا على أنهن مارسن العادة السرية وذلك بإيلاج الاقلام و الشموع و علب الشامبو الفارغة و ذلك كبديل عن عضو التناسلي الذكري) [٥٤]

واته: وەهەندێك لەو ئافرەتانەی كەتوشی نەخۆشی (هیستریا) [٥٥] دەبن هۆیەكەی هەر ئەوەیە كە بەردەوام ئەم كردارە ئەكەن لەڕێگەی بەكارهێنانی قەڵەمەوە یان لەڕێگەی مۆم و قەباغی بەتاڵی شامپۆوە كەلە بریتی (عەورەتی) پیاو بەكاری دێنن.

---

(٥٣) الإنحرافات الجنسية/ص٦٧- حياتنا الجنسية/فريدريك كهن.

(٥٤) الإنحرافات الجنسية عند الرجل و المرأة/ص٦٧/جمال مصطفى مردان- أسرار النفس/ص١٠٨/ سلامة موسى/ الناشر مؤسسة(الخانجي) في القاهرة.

(٥٥) هیستریا HYSTRA : نەخۆشییەكی دەروونییە زۆرترین ئەو كەسانە توشی ئەبن كەبۆماوەیەكی دوور، نیشانەكانی كەسێتی هیستریایان تیدامەیە، یۆنانییە كۆنەكان ئەم نەخۆشییەیان ناوناوە (هیستریا) كەلەوشەی(هستریا-HYSTRIA) وەریان گرتووە كەبەمانای مندالدانی ئافرەتە، هۆی ئەم ناولنانەش ئەوەیە كەوایان زانیوە هۆی توشبوونی وەرگەڕان و هەڵغزانی(مندالانەی ئافرەتە(گرنگترین نەخۆشییە دەروونییەكان/لاپەڕە١١٨/ جلال خلف ژاژڵەیی/ سالی چاپ ١٩٨٤) ئەم نەخۆشییە هەرچەندە زۆرتر توشی ئافرەتان دەبێت و كەمتر توشی پیاوان دەبێ، بەڵام لەكۆندا وایان زانیوە كەنەخۆشی ئافرەتەو هەر توشی ئافرەت دەبێت و توشی پیاوان نابێت، كەواتە مانای وایەنەخۆشی (هیستریا) هەر زۆر لەمێژەوە ناسراوە و زۆر بلاوە و لە چەند شێوەی نەخۆشی جەستەیدا خۆی دەردەخات وەك(ڕشانەوە، لێ لێ‌هاتن، سەرئێشە، ئیفلیج بوون) وە هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی بزانرێت كە ئەم نەخۆشە توشی ئەم جۆرە نەخۆشیە بوو بێت.

وە(جلال خلف ژاژڵەیی) لەکتێبی (منداڵ لە قۆناغی دوامنداڵی و هەرزەکاریدا) دەڵێ:
گیرو گرفتی هەرزەکار ئەوەیە کە لەپڕ دەبینێ ئارەزوویەکی بێ سنووری هەیە لەبارەی توخمەوە لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت ئارەزووی خۆی بشکێنێ یان تێری بکات، لەبەر ئەوەی کۆمەڵ سنور و یاسای ڕاستی داناوە بۆ تێرکردنی توخم، جا لەبەر ئەوە ئەم ئارەزوو شکاندنە بۆ هەرزەکار بەئاسانی نایەتە دەست، پاشان پەنا دەباتە بەر ئاسان ترین ڕێگە ئەویش(ئیستیمنائە) هەرچەند لەدوایدا هەست بەپەشیمانی و گوناهباری دەکات، بەڕاستی کوڕان زۆر زیاتر ئەم ڕێگەیە بەکار دەهێنن بۆ شکاندنی ئارەزووی توخمی خۆیان، بەڵام کچان زۆر بەکەمی بەکاری دەهێنن.

زانای بەناوبانگ (أوسفلد شفارتس) دەڵێ:[٥٦] ئامانجی ئافرەت لەتوخمدا زازوزێیە و منداڵ بوونە، لەبەر ئەمە ئارەزووی ئافرەت متەو (الکابت) بێدار نابێتەوە بەوکەسە نەبێت کە بتوانێت بێداری بکاتەوە.

پاشان ئەو ئافرەتانەی کە دەکەونە هەڵەوە زۆر تر بەخواستن و هێنانیان دەخەڵەتێنرین، لەدواییدا کۆمەڵ بەچاوێکی بێ بەزەیی ورسواییەوە تەماشایان دەکات[٥٧]

---

(٥٦) علم النفس الجنسي/ص٤٠/أوسفلد شفارتس/تعريب/ شعبان بركات. من منشورات المكتبة العصرية صيدا_ لبنان.

(٥٧) منداڵ لەقۆناغی دوامنداڵی و هەرزەکاریدا/ لاپەڕە ١٠١/ خلف ژاژڵەیی/ چاپخانەی حسام بغداد ساڵی ١٩٨٣.

# هۆکارەکانی فێربوونی پاڵنەری ئەنجام دانی کاری ئیستیمناء

*١) الصدفة و الفضول:*

١) یەکێک لەو هۆیانەی کەدەبێتە هۆی پەنابردن بۆ ئەم کردارە، بریتی‌یە لە رێکەوت و هەقوتاندن (خۆ هەڵ خورتاندن) .. ئەو رێژە ئاوە-مەنی‌یە-ی کەلە لەشی مرۆڤدایە، کەکاتێک ئارەزووی توخمی جولا ئەوا پاڵی پێوە دەنێ و ناچاری دەکات کەپەنا بەرێتە بەر ئیستیمناء[٥٨].

٢) إن التعود على ممارسة العادة السرية مؤسف جدا لأنه حتى ولو تزوج ومارس علاقات جنسية طبيعية فإنه سيظل و يتلذذ بجنس من طريق الاستمناء[٥٩].

واتە: خوو پێوە گرتن بەڕاستی ئەنجام دانی ئەم کردارە و بەردەوام بوونی لەسەری کارێکی زۆر دڵگرانە و کردارێکی ناپەسەندە، ئەگەر چی (خێزانی شەرعی) بهێنێ و کردارێکی جینسی ئاسایی رێک و پێک بەئەنجام بگەیەنێ، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانەی کەئەم کردارە ناسروشتی‌یە(غیر طبیعي) باچاک بزانن سبەینێ ئەگەر ژنیش بهێنن ئارەزووی دەروونیان بەو خێزانە شەرعی‌یەی خۆیان ناشکێ.

٣) دەست نەکەوتنی هاوبەش (هاوسەر) .. عدم تيسر الشريك الطبيعي لممارسة الجنس وهو السبب الرئيسي للإستمناء[٦٠].

کەدەبێتە هۆی پاڵنەری ئیستیمناء و نەبونی خێزانێکی شەرعی‌یە، کە سەرەکی‌ترین خاڵیانە کەسەر ئەکێشێ بۆ ئەم کردارە.

٤) النفور من الجماع[٦١].. بێزاری لە جووت بوونی سروشتی: هەندێک لەخەڵکی هەیە کە دەروونێکی رێز پەڕ( شاذ)یان هەیە و هەر لەسەرەتاوە ژن هێنان رەت(رفض)ی دەکەن، پێش بینی ئەوەی لێ ناکرێت کەخێزانی شەرعی پێکەوە بنێ، جا لەبەر ئەو هۆیە پێش بینی ئەم کردارەی لێ دەکرێت بەرێژەیەکی زۆریش.

٥) عدم إشباع الشهوة في الجماع[٦٢].. تێرنەبوونی ئارەزوو بە جووت بوونی سروشتی، پەنا بردنی بەر ئەنجام دانی کاری ئیستیمناء ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەکاتی جیماع کردندا (پێک گەیشتنی شەرعی ژن و پیاو) ئارەزوویان تێر نابێت و ناگەنە (چێژی راستەقینەی) خۆیان، لەبەر ئەوە هەڵدەستن بەکردنی ئەم کردارە.

---

(٥٨، ٥٩، ٦٠، ٦١، ٦٢) الإنحرافات الجنسية/ص٦٩-٧٠-٧١ /جمال مصطفى مروان - حياة العزاب و المراهقين/ ص٤٧-٤٨-٤٩/ الجنسية والتناسلية.

٦) شدة الشبق الجنسي[٦٣].. زۆری ئارەزووی توخمی (تەوژمی ئارەزووی زۆر) کەلەم کاتەدا ئەو کەسە ناتوانێ ئارەزووی جنسی تێر بکات، لەبەر ئەوە پەنادەباتە بەر ئیستیمناء کردن و تێر بوونی ئارەزووی توخمی.

٧) حب التبدل و التنوع: هناك عدد كبير من الإتصالات الجنسية المفتقـــرة إلى الإحســـاس بالعاطفة تدفع الازواج عاجلا أو آجلا إلى الإستمناء[٦٤]

واتە: حەز کردن لە گۆڕین و جۆر بەکارهێنان: چەند کۆمەڵێک لەخەڵکی هەن لەبەر ئەوەی زۆر ئارەزووی بەخێرا گەیشتنی خێزانن و بەئاواتەوەن کە زووپێ‌ی بگەن، لەبەر زۆری هەست و سۆز و (عاطفة) یان، لەهەمان کاتیشدا ناتوانن زۆر زوو پێ‌ی بگەن جا لەبەر هەر هۆیەکی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی بێت، لەبەر ئەوە ناچار پەنا دەباتە بەرکردنی ئیستیمناء.

(ئەمە چۆنیتی سەر هەڵ دان و دروست بوونی ئیستیمنایە لەڕوانگەی کتێبە جینسی‌یەکانەوە، دەربڕینی بیر و ڕایانە سەبارەت بەئەم کردارە).

ئێستاش بەپشتیوانی خوای گەورە دێینە سەر زەرەرو زیانەکانی(ئیستیمناء)، ئەو زەرەرو زیانانەی کەزانستی ئەمڕۆ دەست نیشانی کردووە و پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە، هەتا کەمێک لە خراپی ئەم کارە ئاگادار بینەوە خۆمانی لێ بپارێزین.

---

(٦٣) الإنحرافات الجنسية /ص٧١- حيات العزاب والمراهقين/ص٤٨.

(٦٤) الانحرافات الجنسية/ ص٧١- حيات العزاب والمراهقين/ص٤٨- إجعل حبك دافئاً/ كامل مهدي/ القـــاهرة/ المكتـــب التجاري/ بيروت.

# زەرەرو زیانەکانی ئیستمناء

١) الصراع الفكري الذي يحدث للإنسان الذى يمارس العادة السرية و شعوره بالخوف من الإصابة بالأمراض والخجل من المجتمع الأمر الذي يودي الى فقدان الإنسان الثقة بنفسه وقد يكون ذلك سببا من الأمراض النفسية كاأعصاب أو الأذهان في أبعد الحالات [٦٥] ..

١- شەڕی دەروونی: ئەو کەسە زۆر نزیک دەبێتەوە کەتوشی بەربەرەکانی بیری (الصراع الفكري) و بەربەرەکانی دەروونی (الصراع النفسي) ببێتەوە کەسەرئەنجامی ڕووداني ئەمەش ئەنجام دانی کاری ئیستیمنایە، دیارە ئەو کەسانەی کەئەم جۆرە کردارانە ئەکەن لە ناخی خۆیاندا هەست بەپەشیمانی و بەکەم و کوڕی و ترس و تاوانباری ئەکەن، وە لە هەمان کاتدا ترسی نەخۆشی و بەکەم سەیرکردنیان هەیە لەناو کۆمەڵگادا، کەلە ڕاستیدا ئەمەش ئەبێتە هۆی دەرون نزمی و دابەزاندنی کەسایەتی، وە ئەمانەش سەر ئەکێشن بۆ توشبوونی نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکانی وەک دڵە ڕاوکێ و شێواوی عەقڵی، کە هەموو ئەمانە دوا بەدوای ئیستمناء ڕوو بەڕووی ئەبنەوە.

٢) *الإفراط*: إن الشهوة الجنسية الناقصة التي يحصل عليها نتيجة لممارسته العادة السرية تدفع الإنسان الى الإفراط من الإستمناء وذلك للحصول على لذة أكثر وقد قال فاوست: كلما دفعتني ميولي نحو اللذة.. كلما إزداد عطشي لها أيضا..[٦٦].

٢- زیادە ڕەوی و زۆر بەکارهێنان: زیادەڕەوی کردن لە ئیستمنائدا و لەبەفیڕۆدانی ڕێژەیەکی زۆری (مەنی)یەکەی هەڵبەتە مەنی هێنانەوەی مرۆڤ بەم ڕێگە زۆر دژوارو زۆر زیان بەخشە، زانایانی دەروون زانی (علماء علم النفس) دەڵێن: وێنەی ئیستیمناء وەکو وێنەی (شریقه) وایە، بە واتا ئەو کەسەی کە بەڕێگەی ئیستیمناء مەنی خۆی ئەهێنێتەوە، وەکو ئەوە وایە کە شریقەیەک بهێنێ و بیکا بەلەشی خۆیداو پاشان بە هێزو توانا پاڵەپەستۆ لەسەر دەسکی (پەمپی) شریقەکە دروست بکات و ڕایبکێشێ بۆ دیوی دەرەوە، دیارە ڕێژە خوێنێکی زۆر دەردەهێنێ و پاڵەپەستۆشی لەسەر دەمارەکانی لەشی و لەسەر کۆئەندامی

(٦٥) الإنحرافات الجنسية – ص٧٤ .. جمال مردان.

(٦٦) الإنحرافات الجنسية – ص٧٥ – حياة العزاب والمراهقين – ص٥٦.



نێرینەی دروست ئەکات ئیستمناء بەهەمان شێوە و بەتۆپزی ڕێژە مەنی‌یەکی زۆر لە ڕادە بەدەر لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێتە دەرەوە، زانایان ئەڵێن: ئەو (مەنی)یەی کەبەتۆپزی لە ڕێگەی ئیستیمنائەوە دێتە دەرەوە بەشی چەند جارێکی (جووت بوونی ئاسایی خێزانی) خۆی دەکات و بگرە زیاتریش !! بۆ هەریەک لە جارەکانی دروست بوونی ئاسایی‌دا واتە جووت بوونی ئاسایی شەرعی‌دا ئەو کەسە هەست ئەکات نەک تەنها توخمی جینسی تێر بوویێت و بەس، بەڵکو هەموو خانەکانی ناو لەشی و دەروون و ڕۆحیشی هەست بە حەوانەوەو پشوودان و ئارامی ئەکات، بە پێچەوانەی ئیستیمنائەوەیە کە جار بەدوای جار برسێتی توخمەکەی زیاتر ئەبێت و حەز بە دووبارەو سێ بارە بوونەوەی دەکات ، هەروەکو (فاوست) ئەڵێت: (کلما دفعتني ميولي نحو اللذة، كلما إزداد عطشي لها أيضا) [٦٧] .. واتە: هەر کاتێک ئارەزوو پاڵم پێوە بنێ بۆ کردنی ئەو کردارە، ئەوا تینویەتی جینسیم زیاتر ئەبێ بۆی، کە لە ڕاستیدا هەر وایە. کەواتە دەرچوونی ئەو ڕێژە مەنی‌یە زۆرە کەبەهۆی ئەم کردارەوە بەفیڕۆ دەچێ، دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی مەنی لەلەشیدا کە لەشی خۆی پێویستی زۆری هەیە بە ڕێژەیەکی‌وا، لەشی ئادەمیزاد بەلەناوچوونی ئەو ڕێژە مەنی‌یە زۆرە توشی کەم توانایی و بێ هێزی و کەم بینینی و... هتد دەبێت، لەمەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئیستیمناء چارەسەری سەر کوت کردن و مراندنی توخمی و ئارەزوونی‌یەو بەڵکو پاڵەپەستۆی زیاتر دروست ئەکات لەسەر ئادەمیزاد.

٣) تقويض الأعضاء الحسية التي تتعود على الهياج اليدوي والذي يجعله من العسير لإثارته وخاصة بعد الزواج، أو أثناء المقارنة الطبيعية وكل حالة شائعة وخصوصاً عند النساء[٦٨] ..

٣- لاواز بوونی هەستی جنسی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ کە خوو ئەگرن بەوروژاندنی وە لە ڕێگەی دەستەوەو بەبێ دەست ناوروژێن، بە ڕادەیەک وای لێ دێت کە زۆر نارەحەت نەبێت ئەو ئەندامە ناجوڵێت بە تایبەتی دوای ژن هێنان، یان ئەگەر بەراوردی بکەی بە حاڵەتێکی سروشتی، ئەمە بەشێوەیەکی بەر بڵاو دیارە بەتایبەتی لای ئافرەتان.

---

(٦٧) الإنحرافات الجنسية - ص٧٥ - جمال مصطفى مردان - مكتبة النهضة - بغداد.

(٦٨) الإنحرافات الجنسية - ص٧٥ - حياة العزاب والمراهقين - ص٥٦ - مشكلات وحلول.

٤) *عدم الإرتواء:* إن العادة السرية لا تودي الى الإحساس بالشهوة الجنسية الكاملة حيث إن العلاقة الجنسية الطبيعية هي ليست علاقة بين اعضاء الجنس فقط، وإنما أعضاء الجسم الحسية والنفسية كاملة. ولذلك فإن الإستمناء لا يودي إلى اللذة الجنسية الحقيقية (٦٩).

**٤- تیر نەبوون و دانەمرکان: دیارە کرداری ئیستیمناء هەرگیز کارو فەرمانی جووت بوونی ئاسایی بەئەنجام ناگەیەنێ، وە ناگاتە ئەوەی جێگەی ئەو جووت بوونە شەرعی‌یە بگرێتەوە، چونکە کرداری ئیستیمناء تەنها شێکەو لەگەڵ کۆئەندامەی نێرینەو مێینە ئەکرێ و هەر ئەویش خۆشی و لەزەت وەرئەگرێت و هیچ لایەنێکی گیانی و دەروونی بەشدار نی‌یە لەگەڵیدا، بەلام جووت بوونی شەرعی زۆر پێچەوانەوەیە و هەموویان لەو خۆشی و رابواردنەدا بەشدارن و هەموشیان لە دواییدا هەست بەحەوانەوەو پشوودان ئەکەن.**

٥) تعب الأعضاء المخية نتيجة للتخيلات والهياجات المفاجئة والإرتواء المفاجيء والشعور بالذنب الموجود في داخل كوامن النفس ووخز الضمير والألم كل ذلك يودي الى الغضب السريع والشراسة في التعامل مع الآخرين ناهيك من الإصابة ببعض الأمراض النفسية (٧٠) ..

**٥- واتە ئیستیمناء دەبێتە هۆی ماندووبوونی ئەندامە جنسی‌یەکان و ئەندامی مۆخی کەبەبۆنەی ئەم لێشاوە مەنی‌یە زۆرەی کە دێتە دەرەوە، وەلەهەمان کاتیشدابەکت و پڕی و لەناوەخت دەردەچێ، دەبێتە هۆی ماندووبوون و هیلاک بوونی مۆخی، کەلە ناخی دەروونی خۆیەوە هەست بە گوناه و باری تاوانباری ئەکات و ویژدانی لۆمەو سەر زەنشتی ئەکات، وە ئەم شتانەش ئەبنە هۆی خێرایی تورە بوونی و خراپ جوڵانەوەی لەگەڵ دەورو بەرەکەیدا، وە دەبێتە هۆی هەندێک لە نەخۆشی‌یە دەروونی.**

٦) ليس الإستمناء عمل خير: يغمر الدماغ في أثناء الجماع فيض من الهياجات الممتعة واللذيذة، وليستعيض المستمني عن هذة الهياجات، يلجأ مضطراً إلى تحريك مخيلة فتحتاج هذه إلى بذل جهد فوق طاقتها فتتأذى) (٧١).

---

(٦٩) الإنحرافات الجنسية – ص٧٥ – حياة العزاب والمراهقين – ص٥٦ مشكلات وحلول.

(٧٠) الإنحرافات الجنسية – ص٧٦ – مكتبة النهضة – بغداد – ٩٨٣.

(٧١) حياة العزاب والمرهقين – ص٥٦ – مشكلات وحلول.



واتە: کردنی ئیستیمناء کردارێکی چاک نیيە، چونکە بەکردنی ئەم کارە پێویستی بە هەوڵ و ماندوو بونێکی مێشکی هەیە کە ئەمەش زۆری ئازار ئەدات، بەڵام لە جووت بوونی شەرعیدا وا نیيە و مێشک و دەماغ ڕێڕەوی خۆیان ئەگرن و بەهێمنی و بەلەسەرخۆیی کاری ئاسایی خۆیان ئەنجام ئەدەن و هیچ شپرزە نابن، بەڵام کرداری ئیستیمناء زۆر شپرزەیان ئەکات و کارەکانیان بەکەم و کورتی بەئەنجام ئەگەیەنن.

٧) الإستمناء يعاكس ويسبب الغضب [٧٢]

واتە: ئیستیمناء دەبێتە هۆی یاخی بوون و تووڕە بوون.

٨) الإستمناء يخفض كثيراً إنشراح الحياة والقدرة على العمل [٧٣].

واتە: ئیستیمناء خۆشی ژیان و کار کەم دەکاتەوە:

ئیستیمناء هیوای گەش و ئاسۆی ژیان و خۆشبەختەوەری و ڕوانین بۆ ژیان بەسنگێکی فراوانەوە لە دڵی مرۆڤدا کەمی ئەکاتەوە و ئەیکوژێنێتەوە، وە توانای لەسەر کارکردن ناهێڵێ و بێ تاقەت و زەبوون و بێ دەسەڵاتی دەکات.

٩) الإستمناء لا يؤدي الى اللذة الجنسية الحقيقية: يقوم الإستمناء مقام الجماع في بعض الظروف، غير أنه لا يؤدي الى اللذة الجنسية الحقيقة، وعلينا أن ننسى ان الجماع هو حدث هام، إذ يعتبره الإنسان المتمدن كإتحاد كلي يستلم فيه كائنان لبعضهما، ويتبادلان المتعة طيلة فترة معينة ويعكس ذلك فللأستمناء هو حدث غير هام لأنه يجرى في الوحدة[٧٤].

ئیستیمناء لەزەتی ڕاستەقینەی جنیسی لێ پەیدا نابێت: وە ئەو کەسانەی کەئەم کردارە ئەکەن لەهەندێ کاتدا لەجیاتی( جیماعی شەرعی ) ئەنجامی دەدەن، بەڵام هەرگیز جێگای( جیماعی شەرعی ) ناگرێتەوە، نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە( جیماعی شەرعی ) شتێکی زۆر ئاسایی و ( طبیعـي )یەو سروشتی خۆیەتی، وەتەنها( جێ شەرمی ) خۆشی و ڕابواردن وەرناگرێت و بەس، بەڵکو هەست و دڵ و دەروون و گیانیشی بەشدار ئەبن لەم ئارەزوو وەرگرتنەدا و هەموو بۆیەکتری هۆگردەبن و گۆڕینەوەی جۆر بەجۆر ئەکەن بەڵام ( ئیستیمناء ) تەنها( نێرینە و مێینە ) لەزەت وەرنەگرێت و بەس.

---

(٧٢، ٧٣) حياة العزاب و المراهقين/ ص٥٦-٥٧/ مشكلات وحلول.

(٧٤) حياة العزاب و المراهقين/ ص٥٦/ مشكلات وحلول.

١٠) ولاريب في أن اللذين يدمنون الإستمناء يضرون أنفسهم من وجوه كثيرة[٧٥].

واته: گومانی تیدانی‌یه كه‌ئه‌و كه‌سانه‌ی ئیستیمناء ئه‌كه‌ن به‌به‌رده‌وامی، ئه‌وا بابزانن زه‌ره‌رو زیانیكی زۆر ئه‌ده‌ن له‌نه‌فسی خۆیان له‌زۆر ڕووه‌وه.

١١) إن العادة السرية تخلق الضر بأعصاب التناسلية و ترهق الجهاز العصبي[٧٦].

ئیستمناء زه‌ره‌ر و زیانیكی زۆر ئه‌گه‌یه‌نیت به كوئه‌ندامی نیرینه كه‌مه‌نی تیدا دروست ئه‌بیت، وه‌ده‌بیته هۆی شیواندنی میشكی.

١٢) فقدان الذاكرة[٧٧].

ده‌بیته هۆی له‌بیر چوونه‌وه‌و له‌یاد چوون.

١٣) الشلل[٧٨]: ده‌بیته هۆی شه‌له‌لی و له‌كارخستنی ده‌ماره‌كانی له‌شی.

١٤) حدبة في الظهر[٧٩]: ده‌بیته هۆی پشت كوڕی و ئازار گه‌یاندن به‌پشت.

١٥) الاختفاء الاعضاء التناسلية [٨٠] : بێ هیز بوونی ئه‌ندامی نیرینه‌و ئه‌ندامی مێینه‌ی.

١٦) الخوف المبكر[٨١]: زۆر ترسان(ترسنۆكی) واته له‌ساده‌ترین شت ده‌ترسیت.

١٧) عدم القدرة على إنجاب الأطفال[٨٢]: توانای خستنه‌وه‌ی نه‌وه‌ی نابیت زۆر جاریش ده‌بیته هۆی نه‌زۆكی.

١٨) ظومية الدماغ[٨٣]: لاواز كردن و كپ كردنی ده‌ماغ.

١٩) الانحلال الخلقي[٨٤]: ره‌وشتی له ڕیره‌وی سروشتی خۆی لائه‌دا.

٢٠) فقدان الذاكرة والعمود الفقري[٨٥]: ده‌بیته هۆی له‌بیر چوون و زیان گه‌یاندن به‌بربره‌ی پشتی مرۆڤ(عمود الفقري).

٢١) تعطل الجهاز الحسي، لأن الاعصاب تتعود على الحث اليدوي و تصبح هذه الحالة دائمية[٨٦]: ده‌بیته هۆی له‌كاركه‌وتنی ئامێری هه‌ستیاری چونكه به‌هۆی دووباره كردنه‌وه‌و سێ باره كردنه‌وه‌ی كه‌ئه‌مه‌ش ده‌بیته كاریكی به‌رده‌وامی ئه‌م كرداره، كه‌واته ئامێری هه‌ستیار له‌م نیوانه‌دا له‌كار ده‌كه‌ویت.

---

(٧٥) النظرية الجنسية/ ص٢٨١-٢٨٢/ترجمة د. أحمد طلعت.

(٧٦) الجنس و هدم الاعصاب/ص١٤٦/ د.حسام ناصر العلوجي.

(٧٧، ٧٨، ٧٩، ٨٠، ٨١، ٨٢، ٨٣، ٨٤) المراهقة و الجنس/ ص١٨/بيد داكو.

(٨٥) رعاية الحب المقبل/ص٩٠/ التربية الجنسية الحديثة/ ترجمة عبد الستار الصافي.

(٨٦) الجنس في حياة كل الانسان/ ص١٥٤/د. عبد الحيدر بوم.



٢٢) العادة السرية تزيد من التعطش الجنس بعكس حالة اللقاء الجنس والـــزواج لأن هـــذا اللقاء الجنسي هي إعطاء اللذات هو إستلام يعيد الشباب بطهر وبشرف فالأعضاء التناسلية ليســت وحدها التي تشترك في هذا الإتحاد فالجسم كله والنفس أيضـــا تشـــعر كانـــه منـــه)[٨٧] كرداری ئیستیمناء تونیەتی توخمی زیاتر ئەكات بە پێچەوانەی دروست بوونی شەرعی، چونكە جوت بوونی شەرعی سروشتی ئاسایی خۆیەتی و دەبێتە مایەی شكاندنی ئارەزووی جینسی، وەوزە ئەگەڕێنێتەوە بۆ گەنج و شەرەفی زیاتری پێ دەبەخشێ، وە لەم حاڵەتەشدا تەنها كۆئەندامی نەوە خستنەوە مافی خۆی وەرناگرێ بەڵكو هەموو بەشەكانی تری گیانی و نەفسی و دەروونی مافی خۆیان تێدا وەردەگرن كە وەكو هەموویان هەست دەكەن كە یەك پارچەن و جیاواز نین لە یەكتری.

٢٣) العادة السرية ترهق الذاكرة و تودي الى حالة الأضطراب فيها[٨٨]

ئیستمناء دەبێتە هۆی بیركردنەوەو شێواندنی تێگەیشتنی و نەمانی بیرو هۆش بە تـەواوی، كـە ئەمـەش ئامـاژە دەكـات بـۆ حاڵـەتی شـێواوی و ناتـەواوی دەروونـی و ژیری(الاضطراب النفسية و العقلية).

٢٤) تولد العادة السرية الحزن و هناك مثل سائد عربي قديم يقول( كل ما هو فارغ من المعـنى دائما بالأحزان) و العادة السرية فارغة من المعنى.[٨٩]

ئیستمناء دەبێتە هۆی دڵتەنگی و خەفەتباری، وەكو ووتەیەكی كۆنی عـەرەبی هەیە و دەڵێ (هەر شتێك خـاڵی بێت لـە واتایـەكی بـاش ئـەوا كۆتاییەكـەی بـە دڵتـەنگی دێـت) وە كرداری ئیستیمناء خاڵیە لە هەموو واتایەكی باش و هیچ سوودێكی نییە.

٢٥) العادة السرية حالة غير طبيعية و تجنب الحالات غير الطبيعية هو الشئ الصحيح. لذا تضع بالكف عنها و العمل بهوايات كالرياضة اليدوية و الرسم و النحت و القرآءة و العمـــل و مزاولـــة العملية الجدية. كل هذه لقلل التفكير و تزيد من فرص الحياة للزواج بالطريق السليم الصحيح الـــتي تجعل الثقة بالنفس هي الأساس الرائد لحفظ النوع و الانجاب و الحياة الاحتماعية المسرة عن الحـــزن. إن مزاولة الالعاب الرياضية و الهوايات تخفض كثيراً جداً من الطاقة الجنســـية المكبوتـــة و الطاقـــة الجسدية بصورة عامة فهي علاج للإستمناء في سن الشباب.[٩٠]

---

(٨٧)الجنس في حياة كل إنسان/ ص١٥٤/ د.عبدالحميد بيرم

(٨٨) - - - - - - /ص١٥٤/ - - -.

(٨٩) الجنس ف حياة إنسان ص ١٥٤ د. عبد الحيد بيرم.

(٩٠) الجنس ف حياة كل إنسان ص ١٥٤ تمتع بالحب والجنس ص ١٧١ _ ١٧٢ – ١٧٣.

واتە: کرداری ئیستیمناء حاڵەتێکی زۆر ناسروشتی‌یە، وە خۆ دوورگرتن لەو کردارە نا ئاسایی‌یە شتێکی زۆر گونجا و ڕاستە، زانایانی دەروون زانی چارەسەرکردنی ئەم کردارەیان بەوە کردووە کە خۆی خەریک بکات بە وەرزش و وێنە کیشان و وێنەگرتن و خوێندنەوەی شتی بە سوودو بە کەڵکەوە، وە بیر کرنەوە لەسەر بە فێرۆنەدانی کاتەکانی ژیانی و خۆ ئامادە کردن بۆ پێکەوەنانی خێزانی بەڕێگەیەکی شەرعی ڕاست و دروست، کەئەم جۆرە بیر کردنەوانە متمانە و بڕوا بەخۆبوون لە مرۆڤدا دروست ئەکەن، کە ئەمەش ئەبێتە هۆی پاراستنی داب و نەریتی کۆمەلایەتی و پاراستنی پاک و خاوێن یەکی دوور لە غەم و پەژارەو گیروگرفت دروست بوون، وەهەروەها بەردەوام بون لەسەر وەرزش وئەو جۆرە هیواو ئاواتانە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ڕێژەی شاراوەی ئارەزووی و زیاد نەکردنی لاشەی بەشێوەیەکی گشتی.

(٢٦) إذا اكثر الشخص، كان لها اضرار حسيمة ونفسية وقد تؤدى إلى سرعة الإنزال و ضعف الانتصاب عند الزوج إلا إن كلا الأمرين موقتان و يزولان غالبا بعد ممارسة العلاقة الجنسية الطبيعة بالزوج، وننصح المصابين بهذه العادة بالإنفتاح على المجتمع وتصدي رغباتهم الجنسية و إملاء فراغهم بالرياضة والمطالعة وغير ذلك من الهوايات المفيدة وباالابتعاد من كل ما يمكن أن يثرهم جنسياً[٩١].

واتە: ئەو کەسەی بە بەردەوامی ئەم کردارە بکات ئەوا دەبێتەوە هۆی زەرەرو زیانێکی زۆری گیانی و دەروونی، وەدەبێتە هۆی زوو (مەنی) هاتنەوەی لە پاشە ڕۆژی پێکەوەنانی خێزانیدا، کە ئەمەش ئەبێتە هۆی تام و چێژووەنەگرتنی ڕاستەقینەی توخمی و پاشان بەئەنجام نەگەیاندنی چلەپۆپەی ئارەزوی هێلکەدانی خێزانەکەی، لەبەر ئەوەی ئەوکەسانەی کەبەم شتەخراپەوە سەرقاڵن باواز لەم کردارە نائاسایی‌یە بێنن و با تێکەلاوی ناوخەڵکی و کۆمەڵگا بکەن و کاتی بێ کاریان ڕێ بگرن لەبەربەرەلایی ئارەزووەکانیان وبەوەرزش و خوێندنەوەی بەسوود و هەرشتێکی‌تر کەسوودی هەبێت پڕبکەنەوە و دوور بکەونەوە لەم کردارە بێ سوودە.

٢٧) إن العادة السرية المفرطة سبب من أسباب الضعف الجنسي، وكذلك السيلان المنوي المنفرط[٩٢].

---

(٩١) تحفة العروس/ ص٣٣٨-٤٤٩/ محمود مهدي الأستنبولي.

(٩٢) تحفة العروس/ص٤٢٣/ محمود مهدي الأستنبولي.

واته: وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کەئیستیمناء زیادە ڕەوی کردنێکی بێ سنووری تێدایە لەڕوانگەی ڕاکێشانی ڕێژە مەنی‌یەکی زۆرەوە، کەدەرچوونی ئەم ڕێژەیەش بەم زۆری‌یە دەبێتە هۆی سەرەکی لاواز کردن و بێ هێزکردنی (تۆخمی) جینسی.

٢٨) وەهەروەها دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ئەو (الحیوان المنوي)یەی کە بەملیۆنەهاو بەملیارەهایان لە دڵۆپێکی ئەو مەنی‌یەدایە کەهۆی سەرەکی‌یە بۆ دروست بوونی منداڵ، وەئەمەشیان خاڵێکی گرنگە لەزەرەروو زیانەکانی ئیستیمناء کەلەپاشەڕۆژدا کاریگەریی‌یەکی زۆری ئەبێت لەسەر دروست بوونی منداڵ[٩٣].

٢٩) بەردەوام لەرزە لەرزەی دەست: ئەوانەی بەردەوام ئەم کردارە بکەن، لەدوارۆژانی تەمەنیاندا کەچوونە ناوساڵەوە ئەوا توشی لەرزە لەرزەیەکی بێ سنور ئەبن.

٣٠) ئازاری پشت و (عەمودی فەقەری)[٩٤]:

بەهۆی دەرچوونی ڕێژەیەکی مەنی زۆر کەبەهۆی ئەم کردارەوە دێتەدەرەوە ئەرکێکی زۆر ئەخاتە سەر بڕبڕەپشت و،کەزانراویشە ڕاوەستانی مرۆڤ بەپێوە و چالاکی و چوست و جوڵانەوەی بەهۆی چالاکی (عمرد الفقري)یەوەیە، کەئەگەر بێت و(عمـرد الفقـري) واتە گازەرای پشت توشی هەر کەم و کورتی‌یەک ببێت ئەوائیتر ئەو کەسە پەکی ئەکەوێت، وەتووش بوونیش بەئازاری پشت ئاەو نەخۆشی‌یە ترسناکەیە کە دەبێت بەردەوام لەژێر چاوە دێری پزیشک و پسپۆڕی پشتدا بێت.

٣١) کەمبوونەوەی تواناو ووزە:

دیارە دروست بوونی ئەو مەنی‌یە بێ هودە نی‌یە لەخۆوە گەشە ناکات، بەڵکو ئەوانەی دەبنەهۆی گەشە کردنی بریتەیە لەو ڤیتامینانەی کەلەناو خۆراکداهەن، کەواتە هەرکاتێک ئەو ڕێژەمەنی‌یە زۆرەی کەلەئەنجامی بەرهەمەکانی خواردەمەنیدا پەیدا بووەو گەشەی کردوە لەڕێگەی ئیستیمنائەوە بەخۆرایی و بەبێ هیچ سودێک فڕێ بدرێ، وەئەو ڕێژەمەنی‌یە زۆرەش کەلەلەشدابەئەو شێوەکت وپڕی‌یە کەم ئەبێتەوە هەرواشتێکی کەم و سادەنیە، بەڵکو ئەبێتە هۆیکەم بوونەوەی ووزەو توانا و چالاکی مرۆڤ، وەهەروەها جێگە پڕبوونەوەشی دیسان پێویست بەخواردنی کۆمەڵە خواردەمەنی‌یەکی چاک ئەکات کەپڕ بن لە هەموو ڤیتامینەکان وەکو گۆشت وهێلکە و بەرهەمە شیرەمەنی‌یەکان.

---

(٩٣) تحفة العروس /ص٤٢٢/ تألیف/ محمود مهدي الأستنبولي.

(٩٤) رعایة الحب المقبل/ ص٩٠/ ترجمة عبد الستار الصافي.

٣٢ ) سووتانەوەی ناوەوەی ( زەکەری ) مرۆڤ:

جاری وانەبێت بەهۆی کردنی زۆری ئەم کردارەوە، ئەوڕێڕەوەی کەمیزی پێدا دێت تووشی ئازار و سووتانەوە ئەبێت و جۆری چۆنێتی میزەکەش دەگۆڕێت لەسپییەوە بۆ مەیلەو زەردی.

٣٣ ) مراندنی هەستیاری دەمارەکانی( زەکەر)ی مرۆڤ:

بەڵێ بەبەردەوامی کردنی ئەم کردارە نائاساییە، دەبێتە هۆی مراندنی دەمارەکانی چێژ وەرگرتن( توخمی ) کەبەدەوری قامیشی( زەکەر)ی مرۆڤەوە دابەش بوون.

٣٤ ) لابردنی ڕەونەقی دەم وچاو:

وەئەم کردارە ئەبێتە هۆی شێواندن و ناشرین کردنی دەم وچاوو لابردنی ڕەونەق و جوانی.

٣٥ ) ئازاردانێکی زۆری هێلکە گوون:

هەڵبەتە ئەوە دەزانین کەجووتە هێلکەی ناو گوون گەورەترین وکارامەترین دەوری دروست کردنی ئەو مەنی‌یە ئەبینن، جا لەکاتێکدا بەهۆی کردنی ئەو کردارەوە، کەڕێژەمەنی‌یەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێ کەئەمەش ئەبێتە هۆی دروست کردنی ئازارێکی زۆر لەسەر هێلکە گون، چونکە شپرزە ئەبن و دەکەونە پەلەپەل و خێرایی بۆ جێگا پڕکردنەوەی ئەو مەنی‌یە زۆرەی کەبەفیڕۆ چووە، کەئەمەش لەئەنجامدا بەتێپەڕ بوونی کات لەچوست وچالاکی و جموجوڵیان کەم ئەکاتەوە و ماندوویان ئەکات وەئەبێتە ئازار لەهێلکە گونەکانیدا.

٣٦ ) قوپانی ڕوومەت بۆناوەوە:

هەروەها ئەم کردارە دەبێتە هۆی لاواز بوون و قوپانی ڕوومەتی بۆناوەوە.

٣٧ ) کەم بوونەوەی هێزی دەمارەکانی قاچی و دەستی:

وەدەبێتە هۆی کەم بوونەوەی هێزی دەمارەکانی دەست و قاچی و چالاکی‌یەکانی کارکردنیان و نارەزوویان بۆ ئیش کردن زۆر کەم ئەبێتەوە بەتایبەتی لەکارو پیشە قورسەکاندا دەرئەکەوێت.



٣٨ ) کاریگەری بژپاشەپۆژی خێزان و ( جووت بوونی شەرعی ):

بەردەوام بوون لەسەر ئەم کردارە بەرێژەیەکی زۆر زەرەر و زیان لەپاشەڕۆژی خێزان ئەدات، بەتایبەتی لەکاتی ( جـووت بوونـی شـەرعی ) و جیمـاع کردنـدا، کەئـەو کاتـە ئـەبینێ گروکلپە و نامەزرۆیەکی توخمی جینسی بەو جیماعە شەرعی‌یە دانامرکێتەوە، چونکە بەهۆی ئیستیمنائەوە لەسنووری خۆی دەرچووە و فـێری زیادەڕەوی بـووە، خـۆ ئەگـەر دەسـتی لێ هەڵنەگرێت ئەوا هیچ سودێک لەو خێزانە شەرعی‌یە نابینێ، خـۆ ئەگـەر هـات و وازی لێ بێنـێ ئەوا بەگوێرەی جیماع کردنەکەی وردەوردە دێتەوە تایم و سروشی ئاسایی خۆی.

٣٩ ) کەم بوونەوەی ڕێژەی هەڵدان و فڕێ دانی مەنی‌یەکەی:

هـەروەها ئـەم کـردارە کاریگەری‌یـەکی زۆر دەکاتـە هـۆی دروسـت نـەبوونی منـداڵ و نەزۆکی(عقم - عـــدم الإنجـــاب الأطفـــال)، چونکـە ئـەم کـردارە هـەڵدانی بـەهێزو بـەتاوی مەنی‌یەبژناو ڕەحمی ئافرەتەکە کە بەهۆی ئیستیمنائەوە زۆر کەم ئەبێتەوە و لاوازی ئەکات، دیاری‌شە کەمنداڵ ئالەو هەڵقوڵانە بەهێزە و تیژ ڕەوی ئەو مەنی‌یـە دروسـت ئـەبێت، کـەوەکو خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿ **خلق من ماء دافق** ﴾ واتە: دروست کراوە ئادەمیزاد لە ئاوێکی هەڵ قولاو، ئەوە توانای بەفەراهم هێنانی منداڵی نامێنێ.

٤٠ ) کەم بونەوەی بڕواو متمانە بەخۆبوون:

یەکێکی تر لەو زەرەرو زیانانەی کەتوشی دەبێت، ئەو کەسە بڕواو متمانە بـەخۆ بوونـی لەدەسـت دەچێـت، توانـای نـابێ زاڵ بـێ بەسـەر کێشـە دەروونـی و ژیری‌یـەکاندا کەئەمـەش لەکەسێتی سەرکەووتویی( الشخصية الناجحــــة )ی کـەم ئەکاتـەوە و دای دەبـەزێنێت، وەئـەم شتانەش دەبنە هۆی ڕوودانی هەندێ کاری نائاسایی و دوور لەئاکار و ڕەوشت و خوونـەریتی جـوان، کەواتـە وەکـو دۆڕاوێـک خـۆی دێتـە پێـش چـاو لـەناو کۆمـەڵگادا و هەست بەکــەم و کورتی‌یەک دەکات لە ناخی دڵ و دەروونی خۆیـەوە، کەناچێتـەوە دۆخـی خـۆی بـەوازهێنانی ئەبێ لەو کارە.

٤١ ) زوو هەستانی( زەکەر )ی و درەنگ دامرکاندنەوە:

چونکە ئەم کردارە ناوازە و زۆر ناسروشتی‌یەو لەهەمان کاتیشدا چارەسـەر نیـە بـۆ تـێر بوونـی توخمـی، ئەگـەر لەهـەر کـاتێکدا بکرێـت، ئـەوا تـایمی سروشـتی خـۆی تێـک ئـەدات،



وەلەدوای کردنەکەی ئیتر لەگەڵ بینینی هەرشتێکی ئارەزوو بزوێندا دەجوڵێ و دەبێتە هۆی ڕاست بوونەوەی ودرەنگ دامرکاندنەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم دیاردەیە لەخێزانی شەرعیدا زۆر کەمتر ئەبێتەوە، چونکە جووت بوونی مرۆڤ بەڕێگەیەکی سروشتی و شەرعی خۆی ئەبێتە هۆی مراندنی ئارەزووی توخمی بۆماوەیەک و هیچ زەرەر و زیانێکی پێ ناگات مەگەر لەکاتێکدا نەبێت کەخۆی زیادە ڕەوی بکات لە (جیماعی شەرعیدا)، بەڵام جیماعی شەرعی وەکو ئیستیمنائەکە نیە کەبتوانێ لە(٥) دەقیقەدا دووسێ جار بیکات، ناتوانێ چونکە ئارەزووی توخمی بەڕێگەیەکی دروست تێر بووەو ئەوەندە چاو برسی نابێت، لەبەر ئەوە داوای دورە پەرێزی تەواوی لێ دەکەین کە بۆ ئەوەی لەو زەرەرو زیانانە کەکوشندەیە بەدور بێت.





# چارەسەرکردنی ئەم کردارە بە ڕێگەی شەرعی

١. چارەسەری یەکەم:

٢. چارەسەری دووەم:

٣. چارەسەری سێیەم:

دیارە چارەسەرکردنی ئەم کردارەش واتە(ئیستینماء) بەلای مرۆڤی بڕوادارو لە خواترسەوە شتێکی زۆر ئاسانە، چونکە ئەو شتانەی کەبە ئیمان چارەسەر بکرێت هەر بە ئاسانی کۆتایی پێ دێت و چارەسەری بنەڕەتی ئەکرێت، چونکە کاتێ کە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿**وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا**﴾ الحشر/٧. واتە ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هێناون وەری بگرن، وە ئەوەی ئەو لێ قەدەغە کردوون وازی لێ بهێنن، کاتێ کەئەم بڕیارە خوایی یە هاتە خوارەوە بۆ موسڵمانان، ئیتر چارەسەری هەموو گیروگرفتێکە ئەکات، دیارە ئەو شتانەشی کەهەموو زانایانی ئیسلام یەک دەنگن و (متفق) ئەبن لەسەری بۆ حەرام کردنی، ئەوا حەرام ئەبێت با فرمایشتی پێغەمبەریشی بە (صحیح) ی لە بارەوە نەهاتبێت، چونکە کاتێ کەپێغەمبەر (ﷺ) (مەعاذی کوڕی جەبەل) ناردی بۆ یەمەن بۆ ئەوەی کەببێ بە ئەمیرو پێشەوایان، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی مەعاذ ئەگەر کێشەیەکیان هێنایە لات چۆنی چارەسەر ئەکەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: دەگەڕێینەوە بۆ قورئان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر هات و لە قورئاندا نەبوو بۆ وەڵامەکەی چی دەکەیت؟ ووتی: ئەگەڕێینەوە بۆ فرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لە فرمایشتەکانی پێغەمبەریشدا نەبوو؟ ئەوجا (مەعاذ) فەرمووی: (بـــالرأي) بەڕای خۆمان چارەسەری بۆ دائەنێین، ئەوجا(فضرب على صدره إستحسانا) واتە: لەبەر چاکی قسەکەی دای بە سنگی (مەعاذ)دا و فەرمووی (الحمد لله الذي وفق رسول رسول الله لما ترضى به رسول الله)[٩٥].. واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی و تەوفیقی نێرراوی پێغەمبەری خوای دا بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا پێی ڕازییە. کەواتە لەم فرمایشتەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە هەر شتێک ئیجماعی لەسەر بێ بۆ حەرام بوونی یان بۆ حەڵاڵ بوونی،

---

(٩٥) الائمة الاربعة/ص٧-١٧ لدكتور أحمد الشرباصي.

ئەوا بەو ئیجماعە حەرام و حەلاڵ ئەبێت. وە ئیجتیهاد کەرانیش( إذا أصاب فله أجـــران ) واتـە ئەگـــەر پێکـــایی و ڕاســـتیکرد ئـــەوا دوو پاداشـــتی بـــۆ ئەنوســـرێت ( وإذا أخطأ فله أجر واحد ) [٩٦].. خـۆ ئەگـەر بەهەڵەشدا چوو ئـەوا یـەک پاداشتی بۆ ئەنوسرێت، واتە لەهـەر دوو بارەکـەدا ئـەوان تاوانبـار نـابن وە گوناهـ لەسـەریان نانوسـرێت. لەبەرئەوە برای بەڕێزم، وورد بین بە لە ڕوانین بۆ ئیجتیهاد و فەتواداان، چونکە حەرام کردن و حەلاڵ کردنی شتێک هەروا شتێکی ئاسان و کەم و سادە نیيە، چونکـە شت حـەرام کـردن و حەلاڵ کردن تەنها بۆ خواو پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

عن أبي عبد الله النعمان بن بشير(رضى الله عنهما) قال: سمعت رســـول الله(ﷺ) يقـــول (إن الحلال بين. و إن الحرام بين، و بينهما أمور مشتبهات، لا يعلمهن كثير من الناس، فمـــن أتقـــى الشبهات فقد أستبرأ لدينه و عرضه و من وقع في الشبهات وقع في الحرام، كالراعي يرعى حـول الحمى يوشك أن يرتع فيه، ألا و أن لكل ملك حمى، ألا و إن حمى الله محارمه ألا و إن في الجســد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله، و إذا فسدت فسد الجســـد كلـــه، ألا و هـــي القلـــب) رواه البخاري و مسلم.

واتە: لە ئەبی عبدالله کە نوعمـانی کـوڕی بەشیرە( ڕەزای خوایـان لێ بێ ) فەرمویـەتی (گویم لە پێغەمبـەر بـوو ئەیفـەرموو: بـە ڕاستی شـتە حەڵاڵـەکان ڕوون و ئاشکران، وە شـتە حەرامەکان ڕوون و ئاشکران وە لە نێوانیاندا چەند شتێک هەیـە کـە گومانیـان تیایـە، کـە زۆر کەس نایان زانێ، هەرکەس خۆی بپارێزێ لە لێک چووەکان واتە ئەو شتانەی گومانیـان تیایـە ئەوە بە دەستی هێناوە، پاکانە بۆ دینەکەیی و بۆ ناموسی،واتە: پاراستنی دیـن و شـەرەفی لە باس کردن و تانەو تەشەری خەڵکی..............هتد ) رواه البخاري و مسلم.

## چارەسەری یەکەم:

زانایان بەگشتی بۆچارەسەرکردنی ئەم کـردارە، تەنها بـەڕۆژوبونیان داناوە بـە بەڵگـەی ئـەم فرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) کەئەفەرموێت: ( عن عبدالله بن مسعود(رضى الله عنه) قال: قال لنـــا رسول الله(ﷺ): يا معشر الشباب من إستطاع منكم الباءة، فاليتزوج، فإنه أغض للبصـــر وأحصـــن للفرج، ومن لم يستطع فعليـــه بـــالصوم، فإنـــه لـــه وجـــاء) [٩٧]. واتـە: ئـەی کۆمـەڵی لاوان ،

---

(٩٦) رواه البخاري ومسلم/ بروانه الاربعين النووية.

(٩٧) متفق عليه.

هەرکەسیکتان توانای ژن هێنانی هەیە با بیهێنێ، چونکە پاریزگاریتان ئەکات لەڕوانین بۆ ئافرەتانی نامەحرەم و داوێنیشتان پارێزراو ئەبێ، وە سەرەتاتکێ ناکەن بۆ ئافرەتان و لەزیناش ئەتان پارێزێت، وەئەوەشی توانای ژن هێنانی نەبوو بابەڕۆژوو بێت، چونکە بەڕاستی ڕۆژوو هێرشی ئارەزوو دادەمرکێنێتەوە )[98].

لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) ژن هێنانی بەچارەسەری یەکەم داناوە، دوای ئەوە ڕۆژووی بە چارەسەر داناوە بۆ ئەو کەسانەی کە توانای ژنهێنانیان نییە، چونکە ئیسلام موسڵمانان هان نادات کەبە تەنها خۆیان بهێڵنەوە، بەڵکو هانیان ئەدات بەوەی کەخێزان پێکەوە بنێن و کۆمەڵگا ی مرۆڤایەتی بەنەوەو وەچەی تازە و پەروەردە کراو ئاوەدان بکەنەوە، خۆنەگەر موسڵمان لەکۆمەڵگایەکی نەفامیدا بژی باشترین چارەسەر بۆ خۆپاراستن لەگوناهـ ڕۆژوو گرتنە. بەڵێ ئەو گەنجانەی کەدەسەلاتیان نیە ژن بهێنن یابەهۆی خوێندنەوە یان هەر ڕێگرێکی ترەوە، بۆ ئەوەی خۆیان بەپاکی رابگرن و ئاوێنەی دڵیان بەگەردی گوناه و تاوان لێڵ نەبێت، ئەوا سوننەتە کە بەڕۆژوو بن، تا بەهۆی ڕۆژووەوە ئارەزوی ملهوڕی جینسی لاواز و سەرشکێن بکەن و بتوانن زاڵ ببن بەسەریدا. بۆ یەزانای ئەڵمانی (گیهارت) دەڵێ: (ڕۆژوو کارامەترین هۆیە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لغاوی دەروونی خۆی بەدەستەوە بێت، وەبەندە یەخسیری هەواو هەوەس و ئارەزووی نەبێت) [99]. وەهەروەها ڕای زۆربەی زاناکانیتر لەسەر ئەوەیە کەتەنها ڕۆژووە بتوانێ کەجڵەوی ئەسپی سەرکێشی نەفس و ئارەزووە جینسییەکان بگرێت.

جابەراستی نەفسی سەرکێش تەنها بە ڕۆژوو برسێتی و تونیوەتی دێتە ژێر بارەوەو کز و لاواز دەبێت، کەواتە چارەسەری یەکەم بۆ (ئیستیمناء) ڕۆژوو گرتنە.

---

(٩٨)فتح الباري/م /٩/ ص١١٠-١١١/ للأبن حجر العسقلاني.- نيل الاوطار/م/٦/ ص١٠٤/ للشوكاني.

(٩٩) روح الدين الاسلامي/ ص٢٥٦/ عفيف عبدالفتاح طبارة- روح الصيام في الاسلام/ص٢٥٤/ عفيف عبدالفتاح طبارة.

*چارەسەری دووەم:*

هەرکاتێک مرۆڤ ئارەزووی دەروونی جوڵا، با بیر لەمردن و ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە بکاتەوە، بابزانێ کە ئیمامی عەلی(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرمویت: (کم من شهوة ساعة الهمت حزنا طویلا)[100] ، واتە: زۆر جار ئارەزوو و ... واردنی سەعاتێک غەمی درێژ خایەن بەجێ دێڵێ بۆ خاوەنەکەی، کەواتە پێش کر... ی کارەناشەرعی‌یەکە بابیر لەسزاو تۆڵەکەی بکاتەوە،وە با بیر لەوەبکاتەوە ئەگەر بێت و بەئەنجامی نەگەیەنێ چاکەو خێرێکی زۆری لەبەردەمدایە و بۆی ئەنوسرێت، وەلەباتی نەفس و شەیتان و بیرکردنەوە لەڕابواردنی جینسی حەرام، باخۆی‌سەرقاڵ بکات بە یاد کردنەوەی خواو پاڕانەوەو پشت بەستن بەخوا هەتا لەو گوناهانە بەدووری بخاتەوە، وای لێ بکات کە دوور بکەوێتەوە لەتەسلیم بوون بەنەفس و ئارەزووەکانی، بۆ ئەوەی ترس و ئیمان و نوری خۆی بخاتە داو دەرونیەوە، تا خواش ترس و گەورەیی خۆی لەبەر چاوی گەه... بکاتەوە و نەوێرێ گوناه و تاوان بکات، خوای گەورەش ئەفەرمویت: ﴿ ومن تق السیئات یومئذ فقد رحمته ﴾ غافر/٩. واتە: هەرکەسێ خۆی لەگوناه بپارێزێ و کەنارگیری لێ بکات لە ڕۆژی دوایدا ڕەحمی پێ دەکرێ و دوور ئەخرێتەوە لێی، وە ﴿ ومن یتوکل علی الله فهو حسبه ﴾ الطلاق/٣. وەهەرکەسێکیش پشت بەخوا ببەستێ لەهەموو شتێکدا ئەوا ئەوی بەسە.[101]

*چارەی سێیەم:*

دیارە مرۆڤ هەر چەندە یادی خوای پەروەردگار بکات، ئەوا بە ئەندازەی ئەو یادە بیر و باوەڕەکەی وزیاد ئەبێت، وەدڵ و دەروونی زیاتر درەوشاوە ئەبێت، دیاریشە کەهەرکاتێک مرۆڤ یادی خوا بکات ئەوەشەیتان خۆی لێ دوور دەخاتەوە و هیچی پێ ناکرێت مادام ئەوکەسە لەیادی خوای گەورەدا بێت.

بەڵێ یادی خواکردن لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ڕێزی تایبەتی خۆی بۆ دانراوە، ئەوە تاخوای پەروەردگار ئەفەرمویت: ﴿یا أیها الذین آمنوا أذکروا الله ذکرا کثیرا و سبحوه بکرة وأصیلا ﴾ الأحزاب/٤١-٤٢. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە یادی خوای

---

(١٠٠) الف کلمة مختارة لأقوال إمام علي (رضي الله عنه) /ص١٣.

(١٠١) التربیة الاسلامیة/ع/٣/ص١٥٨ ربیع الاول ١٤٠٧هـ تشرین الثاني ١٩٨٦.

گەورە زۆر بکەن، پاکیو خاوێنی بۆ دەربڕن لەبەرەبەیان و ئێواراندا » چونکە ئەو دوانە سەروبنی ڕۆژن)، بەڵێ، ئەوەندە یادکردن بەلای خواوە سەنگینە هەرکەسێ یادی بکات ئەویش یادی ئەوکەسە ئەکات، وەکو ئەفەرموێت﴿ **فاذكرونى أذكركم** ﴾ البقـــرة/٥٢. واتـە: ئێوە یادم بکەن منیش یادتان ئەکەم، جا بۆ ئەوەی کاری موسڵمانانیش لەسەرزەویدا بەرهەم داربێت و ئەنجامەکەی زیان و زەرەری دونیا و قیامەتی نەبێت، وەبۆ ئەوەی وەک هەڵگرانی ڕێبازی کوفر و خوا نەناسی نەبنە مایەی ئاژاوە و پشێوی بۆژیانی ئادەمی پێویستە بەووردی سەرنجی قورئان بدەن، بۆ نموونە ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڕەشە ئەکات لەوانەی لەم ژیانەیاندا دور لەیادی خواوە ئەژین، وەبێ ئاگان لەخواپەرستی وزیندوو کردنەوەی دڵەکانیان بەزیکرو پاڕانەوە ودڵ بەستن بەخواوە کەئەفەرموێت: ﴿ **ومن يعش عن ذكر الرحمن نقيض له شيطانا فهو له قرين، وإنهم ليصدونهم عن السبيل و يحسبون إنهم مهتدون** ﴾ الزخرف/٣٦-٣٧.

واتە: هەرکەسێ چاوی خۆی بنوقێنێ و خۆی بێ ئاگا بکات لە قورئان و بەندایەتی خوا، شەیتانێکی بۆ دائەنێین کە هەمیشە لەگەڵی بێت و لێی جیا نەبێتەوە، ئەو شەیتانانە ڕێ دەگرن لەو کافرانە کە بێینە سەر ڕێگەی ڕاست کە ئیسلامە. کافرەکانیش وا گومان دەبەن کە لەسەر ڕێگەی ڕاستن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە کە لە تەفسیری( زبدة التفسير من فتح القدير )دا هاتوە بەم شێوەیە:

کافرەکانی قورەیش ووتیان بۆ هەریەکێک لە هاوەڵانی محمد(ﷺ) پیاوێک دیاری بکەن کە لەگەڵیدا بێ و لێی نەبێتەوە، طەڵحەی کوڕی عبدوڵایان دیاری کرد بۆ ئیمامی ئەبو بەکر. طەڵحە ڕۆیشت بۆلای ئەبو بەکر کە لە ناو کۆ مەڵێک خەڵکدا بوو، ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی طەڵحە بۆ چ شتێکم بانگ دەکەی؟ طەڵحە ووتی: بۆ پەرستنی لات و عوزا، ئەبو بەکر فەرمووی( لات ) چییە؟ طەڵحە ووتی: کوڕی خوایە( پەنا بەخوا ). ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی( عوززا )چییە؟ طەڵحە ووتی: کچی خوایە( پەنا بەخوا )!!. ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی دایکیان کێیە؟ طەڵحە بێدەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە. پاشان طەڵحە بە هاوڕێکانی ووت: وەڵامی ئەو پیاوە بدەنەوە، هەمویان بێ دەنگ بوون و کەس وەڵامی نەدایەوە، طەڵحە ووتی:

هەستە ئەی ئەبو بەکر یەکسەر طەلحە ووتی( أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمداً رسول الله ) لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە﴿ و من یعش عن ذکر الرحمن...﴾ الزخرف/٣٦-٣٧.

جامەلگرانی قورئان ئەبێت ئاگادار بن، لاسایی هەلگرانی کوفر و نەفامی نەکەنەوە لە هەلس و کەوتیانا، بەلکو بەرنامەی خۆیان دیارییە و خوا نەخشەی بۆ کێشاون کەچۆن یادی بکەن، ئەگینا هەڕەشەکە ئەمانیش ئەگرێتەوە و لەبەرگی ئامۆژگاریکەرو ڕێپیشاندەردا شەیتانێکیان بۆ دەکات بەهاوڕێ و لەڕاستە شەقامی خواناسی و بەندایەتی راستەقینە ئەیان ترازێنێ و خۆشیان وائەزانن لەسەر ڕێگای راستن بۆیە پێویستە ئینسانی باوەڕدار پەیوەندی لەگەل خودادا هەبێ و هەمیشە سەرقالی یادی خوابێ و هیچ کاتێک لەبیری نەکات. بۆئەوەی خوای گەورەش بەگوێرەی گومانی بەندەکە بەرامبەر بە خوا پاداشتی بداتەوە وەک لەم فەرمودە قودسیەدا خوای گەورە دەفەرموێت: (أنا عند ظن عبدي بي، وأنا معه حين يذكرني فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي وإن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منه، وإن إقترب إلي شبرا تقربت إليه ذراعا، وإن أتاني يمشي أتيته هرولة) رواه البخاري و مسلم.

واتە: خوا دەفەرموێت: من لەگەل گومانی بەندەکانم، وە من لەگەلیدام کاتێ بیرم لێ دەکاتەوە و باسم دەکات.ئەگەر لە دلی خۆیدا یادی منی کرد منیش هەر لای خۆم یادی دەکەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەلێکدا باسی کردم من لە ناو کۆمەلێکی چاکتردا باسی دەکەم کە( فریشتەکانن ). خۆ ئەگەر بەندە بستێک لە من نزیک بێتەوە ئەوا من گەزێک لێی نزیک دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆیشتن بەندە بێت بۆ لای من، من بە ڕاکردن دەچم بە پیریەوە. بۆیە سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەفەرموێت: ( و کل عامل لله بطاعته فهو ذاکر لله ). واتە: هەموو کەسێک کە ئیش بکات لەبەر خوا و گوێڕایەلی خوا بێ ئەوا ئەو کارەی بە یادکردنی خوا ئەژمێرێ.

دیاره فەرمایشتی زۆر هەن لەبارەی گەورەیی یادی خواوە، کەئیمە ناتوانین لێرەدا بیانخەینە روو بەڵکو دەتوانن تەماشای ئەو سەرچاوانە بکەن کە لە پەراوێزەوە دیاریمان کردون*.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە یادی پەروەردگار چ کاریگەری و چ پاداشتێکی گەورەی هەیە لەلای پەروەردگار، وەچ رۆڵێکی کاریگەریی هەیە بۆ پاکە بوونەوەی دڵەکان لەژەنگ و ژاری گوناهو تاوان، وەکاریگەرترین هۆیە بۆ دورخستنەوەی مرۆڤ لەتاوان، جا یادو خوا پەرستی‌یەکە ئەوەندە بەرزو پیرۆز و پارێزەری ئادەمیزاد بێ لەتاوانی گەورە و بچوکە، گوایە ناتوانێ‌ئینسان لە( ئیستینماء ) دوور بخاتەوە و سادەو ساکاری بکات لەبەر چاوی؟ گوایە ناتوانێ ببێتە قەڵغانێکە بۆی و نەیەڵێت تیری ژاراوی شەیتان و هەواو هەوەسی کاری تێبکات؟! ! ئایا نابێتەهۆی رزگار بوونی لەفێڵ و تەڵەکە بازی‌یەکانی نەفس و شەیتان؟!جا ئەگەر وانەبوو، هەڵبەتە ئەوکەسە هیچ تام و چێژێکی لەو یاد کردن و خواپەرستی‌یە وەرنەگرتوە و، ناوەرۆکە و کرۆکە( مفهوم و محتويات )ی یاد کردن هیچ تێ نەگەیشتوە و هەریەسەرزارەکی بەڕێی کردووە و دڵی بێ ئاگا بووە لێی و نەیزانیوە بەرگری‌یەکە لەدڵیدا دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێ پارێزگاری خۆی پێ بکات.

وە بۆ کەم کردنەوەی رێژەی مەنی لە لەشدا پێویست دەکات کە ئەو خواردنانە کەم تر بخورێت کە دەبنە هۆی زیاد کردنی رێژەی مەنی وەکو( گۆشت، هێلکە، بەهارات، قاوە، کاکاو، شیرینی، چا،.....هتد ).

---

* ١) الأذكار للإمام النووي.

٢ ) زیکری خوا ناسان/ حبیب محمد سعید.

٣) تحفة الذاكرين/ للإمام الشوكاني......هتد.

*خوێنەرانی بەڕێز:* لەئەنجامی ێندنەوەی ئەم نوسراوەی بەر دەستتدا بۆت دەردەکەوێت کە بە گشتی زاناکان لەهەموو بوارەکانی شەرع زانی و تەفسیری قورئانی پیرۆزو پزیشکی و کۆمەڵایەتی و دەروون ناسیدا، ئەنجامدانی ئیستیمنائیان بەزیانێکی گەورە داناوە بۆ تاک و کۆمەڵ و لەئەنجامی ئەو زیانانەشەوە فەتوای حەرام بوونیان داوە، ئەی لاوی موسڵمان دە تۆش لە ڕێگەی ئەو چارەسەرانەوە خۆت بپارێزە لەو کارە ناڕەوایە.



# سەرچاوەکانی ئەم باسە


**تەفسیرەکان**

١- في ظلال القرآن — سيد قطب

٢- جامع البيان في تفسير القرآن — الطبري(محمد بن جرير)

٣- تفسير القرآن العظيم — إبن كثير (أبو الفداء بن إسماعيل)

٤- الكشاف عن الحقائق التنــزيل — الزمخشري (محمد بن عمر)

٥- مجمع البيان — الطبرسي (الفضل بن الحسين)

٦- تفسير النسفي — عبد الله بن احمد بن محمود النسفي

٧- البيضاوي — القاضي ناصر الدين البيضاوي

٨- تفسير القرطبي — أبي عبدالله محمد بن احمد الأنصاري القرطبي

٩- روح المعاني للألوسي — الشيخ شهابالدين السيد محمود الآلوسي البغدادي

١٠- التفسير الكبير — للإمام أبا عبدالله محمد بن عمر بن حسين القرشي الشافعي الطبرستانىالأصل الملقب بــ(فخرالدين الرازي)

١١- الجلالين — للأمامين: ١) جلال الدين المحلي ٢) جلال الدين السيوطي

١٢- مختصر لأبن كثير — محمد علي الصابوني

١٣- القرآن الكريم وتفسيره — لجنة من وزارة التربية

١٤- حاشية صاوي — العلامة صاوي لسنة ١٩٣٩

١٥- الخازن — علاءالدين الصوفي البغدادي

١٦- تفسير المومنين — عبد الودود يوسف

١٧- تەفسیری خاڵ — محمدى خاڵ( رەحمەتی خوای لێ بێ )

**سەرچاوە فیقهیەکان**

١٨- فتح الباري، شرح صحيح البخاري — الحافظ شهاب الدين العسقلاني.

١٩- فقه السنة — سيد سابق

٢٠- الترغيب و الترهيب — للمنذري

٢١- الدر المختار، شرح تنوير الابصار.

٢٢- رد المختار على الدر المختار — لأبن زين العابدين.

٢٣- تكملة المجموع — للشيرازي

٢٤- فتح القدير، شرح الهداية    لأبن همام الحنفي.

٢٥- سبل السلام، شرح بلوغ المرام    محمد بن إسماعيل الصنعاني

٢٦- المحلي    لأبن الحزم الظاهري.

٢٧- مجموع الفتاوى    لشيخ الاسلام إبن تيمية.

٢٨- السراج على متن المنهاج    لشرف الدين النووي/ محمد زهري الغمراوي

٢٩ - كتاب فتوى و بحوث شرعية    حسنين محمد مخلوف مفتي الديار مصرية سابقة

٣٠- تفسير و بيان    حسنين محمد مخلوف.

٣١- زواجك أيها المسلم    عبد العليم عبد الرحمن السعدي


## سه رچاوه گشتیه كانی تر


٣٢- الاستعداد ليوم الميعاد    لأبن الحجر العسقلاني

٣٣- الطب النبوي    إبن قيم الجوزية

٣٤- الجامع الصغير    السيوطي

٣٥- روح الدين الاسلامي    عفيف عبد الفتاح طبارة

٣٦- روح الصيام في الإسلام    عفيف عبد الفتاح طبارة

٣٧- النبوة والانبياء    محمدعلي الصابوني

٣٨- المرأة في الفكر الاسلامي

٣٩- تربية الاولاد في الاسلام.    عبد الله ناصح علوان

٤٠- المرأة بين الفقه و القانون    الدكتور مصطفى السباعي.

٤١- نيل الاوطار    محمد بن علي الشوكاني

٤٢- مغني المحتاج

٤٣- المذاهب الاربعة.    الدكتور أحمد الشرباصي.

٤٤- الأئمة الاربعة    لدكتور أحمد الشرباصي.

٤٥- رياض الصالحين.    للأمام النووي.

٤٦- تحريم الخمر في الإسلام.

٤٧- الكبائر    للأمام شمس الدين.

٤٨- قرطبية    للأمام القرطبي.

٤٩- الاتحافات السنية في الاحاديث القدسية.

٥٠- الحلال و الحرام في الاسلام    لدكتور يوسف القرضاوي.

٥١- إختلاف الفقهاء — طبري/ محمد بن جرير.

٥٢- ألف كلمة مختارة — لسيد الامام علي.

٥٣- التربية الاسلامية — جمعية الاسلامية.

**_كتيبه جنسيه‌كان_**

٥٤- الانحرافات الجنسية عند الرجل والمرأة — جمال مصطفى مردان.

٥٥- تحفة العروس — محمد مهدي الاستانبولي.

٥٦- حياة العزاب و المراهقين- مشكلات وحلول.

٥٧- رعاية الحب المقبل   التربية الجنسية الحديثة — ترجمة عبد الستار الصافي.

٥٨- النظرية الجنسية — ترجمة أحمد طلعت.

٥٩- التربية الجنسية — سيرل بيسبي   دار المعارف بمصر   ١٩٦٨م.

٦٠- الحب و الجنس.

٦١- الحب والزواج — د. أمين رويحة- منشورات مكتبة النهضة-بغداد

٦٢- الاضطرابات الجنسية — دراسات سيكولوجية   د.صلاح العدس.

٦٣- حياتنا الجنسية مشكلات وحلولها — فريدريك كهن   بيروت

٦٤- أسرار النفس — سلامة مسى  موسسة الخانجى-القاهرة

٦٥- علم النفس الجنسي — أوشفلد شفارتس-تعريب- شعبان بركات-لبنان

٦٦- المراهقة كيف تفهمه و ترعاه — مارتا هاربين و لآخريات مكتبة النهضة-بغداد.

٦٧- إجعل حبك دافئاً — كامل مهدي -القاهرة -المكتب التجاري-بيروت

٦٨- الجنس و مدم الاخصاب — د.حسام ناصر العلوجي

٦٩- الجنس في حياة كل إنسان — د.عبد الحميد بيرم

٧٠- الرجل و الجنس — د. نوال السعداوي

٧١- المرأة و الجنس — د. نوال السعداوي

٧٢- المراهقة و الجنس — بيداكو

٧٣- الاسلام و الحياة الجنسية — للأستاذ محمود بن الشريف

٧٤- رۆژوو له‌ئیسلامدا — حسن پینجوینی.

٧٥- زیکری خواناسان — حبیب محمد سعید.

٧٦- یادی خودا — علی باپیر وه‌تمان.

٧٧- منداڵ له‌قۆناغی منداڵی و هه‌رزه‌کاریدا — جه‌لال خه‌له‌ف ژاژڵه‌یی.

٧٨- گرنگترین نه‌خۆشی‌یه ده‌روونی‌یه‌کان — جه‌لال خه‌له‌ف ژاژڵه‌یی.

[illegible]

**بـابـەت** | **لاپەڕە**